# دیكارت
# دامەزرێنەری فەلسەفەی مۆدێرن

نووسینی

کوریی بۆ کوردی
کەمال عەلی

# دیکارت
# دامەزرێنەری فەلسەفەی مۆدێرن

نووسینی :دکتۆر مستەفا غالب
وەرگێڕانی بۆ کوردی :کەمال عەلی

چاپی یەکەم

سلێمانی ______ 2005

**ناسنامەی کتێب:**

ناوی کتێب: دیکارت (دامەزرێنەری فەلسەفەی مۆدێرن)

بابەت : فەلسەفە

ناوی نووسەر: دکتۆر مستەفا غالب

ناوی وەرگێڕ: کەمال عەلی

کۆمپیوتەر : شێرزاد موکریانی

نۆبەتی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ : ٢٠٠٥

چاپخانەی : گەنج

تیراژ : ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٥١)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

## پێشەكی وەرگێڕ:

بۆ قسەكردن لەسەر فەلسەفە و ڕەهەندەكانی و و شیتەڵكردنی بیر و بۆچوونەكان لە قۆناغەكانی مێژووی مرۆڤایەتیدا پێویستمان بەتاوتوێكردنێكی زۆر و زەوەند دەبێت بەشێوەیەك لێرەدا جێگای ئەوە نیە بكەوینە وردكردنەوەی ئەو دید و بۆچوونانە.

بەڵام ئەوەی پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بكەین و سەرەداوی مەبەستمانی لێوە دەربخەین ئەوەیە كە گۆشەنیگامان بخەینە سەر ئەو بیرو بۆچوون و فەلسەفانەی كە ئەمڕۆ ناو دەبرێن بە فەلسەفەی هاوچەرخ و مۆدێرن، وە لەمەشدا ناكرێ گرنگترین سەرچاوە و سەرهەڵدانی ئەم فەلسەفەیە نەگێڕینەوە بۆ دامەزرێنەر و بناغەداڕێژی ڕاستەقینەی خۆی كە بێگومان ئەویش "ڕینە دیكارتی" مەزنە فەیلەسووف و سروشت ناس و بیركاری زانی فەرەنسیە، دیارە من لەم پێشەكیە دا نامەوێت هەموو كون و كەلەبەرەكانی فەلسەفەی دیكارت باس بكەم چونكە ئەوەندەی كراوە و لەتوانا دا بووە خوێنەر دەتوانێ لەم كتێبەدا چاو بخشێنێت بە هەموو ئەو بیر و بۆچوون و عەقلانیەتەی دیكارت دا كە وەك فەلسەفەیەكی نەمر و زیندوو بۆی بەجێ‌هێشتووین.

فەلسەفەی عەقلانیەتی دیكارت لەو ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێت كە نایەوێت تەنها بەگریمانە و تاقیكردنەوەی سادە شتەكانمان پێ بسەلمێنێت و دڵنیایمان لا دروست كات بەڵكو ئەو دەیەوێ لە ڕێگەی گومانەوە پەی بە ڕاستیەكان بەرین و تەنانەت گومان لە بوونی خۆشمان بكەین تا كاتێك بە

تەواوی دەكەوین بەسەر حەقیقەت و یەقیندا و گومانەكان دەرەوێنەوە و دەبنە ڕاستی حاشا هەڵنەگر.

ئەوەی لێرەدا و لەم پێشەكیە كورتە دا دەمەوێ ئاماژەی پێ بكەم ئەوەیە بۆیە "دیكارت"م هەڵبژارد و گرنگیم دا بە وەرگێڕانی ئەم كتێبە و ماندووبوون و شەونخوونی لە بەرهەم هێنانیدا لە بەر چەند هۆیەك بوو لەوانە تا ئێستا كتێبخانەی كورد یمان بەجۆرێكی وا هەژار لە بابەتە فیكری و فەلسەفیەكاندا بە زمانی كوردی كە دەتوانم بڵێم لە پەنجەكانی دەست تێپەڕ ناكەن و ئەوانەش كە هەن و كراون كەم یان زۆر نەچوون بە لای ئەم فەیلەسووفە گەورە و ناودارە دا لەشێوەی كتێب و نامیلكە، تەنها ئەو نامیلكەی مامۆستا ڕەووف بێگەرد نەبێت لە فارسیەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی كوردی و لە زنجیرەی "كتێبی گیرفان"دا بەچاپی گەیاندووە ئەویش وابزانم زۆر بەكورتی چووەتە ناو بابەتەكانی فەلسەفەی دیكارتەوە و هەڵێنجانی چەند دڵۆپێكی كەمن لە دەریای بیر و فەلسەفەی دیكارت.

هۆیەكی‌تریش كە وای لێكردم زۆر بە پەرۆش بم بۆ وەرگێڕانی ئەم كتێبەی "دیكارت" ئەوە بوو دەمبینی كەم تا زۆرێك لە شێوەی كتێب و نامیلكە گۆڕابوونە سەر زمانی كوردی سەبارەت بە فەلسەفە و بەرهەمە فیكریەكانی فەیلەسوف و ناودارانی‌تر وەكو: ئەفلاتوون و نیتشە و سارتەر و كانت و هیگڵ و فرۆید و جان جاك رۆسۆ و فۆكۆ و ڤۆڵتێر بەڵام لەسەر "دیكارت" هیچ كتێبێكی وا نەكرابوو كە تا ڕادەیەك تینوێتی خوێنەری كورد بشكێنێت لە كانیاوی ئەو بیرمەندە بلیمەتە، تەنها ئەوە نەبێت جار وبار لە گۆڤارە كوردیەكاندا شتێكی كەم لە بارەیەوە نووسراوە.

جا لەبەر ئەوە شانم دایە بەر ئەم كارە و ئەوەی لە توانامدا بووبێت درێغیم نەكردووە هەر چەندە ئەبێ ئەوەش لەیاد نەكەم لە بەر نەبوونی سەرچاوە و دەست نەكەوتنی بەرهەمەكانی "دیكارت" بەكتێب نەمتوانیوە زۆر لە دەقی كتێبەكەی دكتۆر مستەفا غالب دەربچم بەڵام ئەوەش دەبێ بگوترێت نووسەر زۆر بە چڕو پڕی لەم كتێبەیدا بیر و بۆچوون و فەلسەفەی دیكارتی پیشانداوە و بەتایبەتی لە ژیان و بەسەرهاتی دیكارت و قۆناغی خوێندن و بەدوا داگەڕانی زانستدا كە زۆر جەزرەبەی ژیانی بینیوە ئەمەش بۆ خۆی تێگەیشتنە لە بەشێك لە بنەماكانی فەلسەفەی دیكارت و پاشان ئاشنا بوون بە بوارەكانیتری بیر و بۆچوونەكانی دیكارت.

لەكۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم بەئەركێكی بچوكی سەرشانم هەستا بم و كەلێنێكیشم پڕكردبێتەوە لە كتێبخانەی هەژاری كوردیدا بەتایبەت لەبواری ئاكارناسی و فەلسەفە دا و باس و بابەتەكانی كتێبەكەش جێ دەهێڵم بۆ خوێنەری بەڕێز و ئامادەی هەموو ڕەخنە و پێشنیارێكی بنیات نەر و دڵسۆزانەشم بە مەرجێك لە خزمەتی زیاتری مەعریفە و ئاستی ڕۆشنبیری بوارە فەلسەفی و زانستیەكاندا بێت.

وەرگێڕ: كەمال عەلی

سلێمانی

شوباتی ٢٠٠٥ی زایینی

## پێشەكی نووسەر

فەیلەسووفی فەرەنسی "رینیە دیكارت" دادەنرێت بە بنیات نەری فەلسەفەی هاوچەرخ ( مودێرن )، هەروەها كاریگەری خۆی جێهێشتووە لەسەر بیریاران و ژیر و زانایان، ئەوانەی وا دووچاری ناوبانگی ئەم فەیلەسووفە ناوداره بوونەتەوە ئەوە دوای ئەوە كاریگەری هەبوە لەسەریان، تا ئێستاش لێكۆڵینەوە و پۆلێن كردنی بەرهەمەكانی بووە بە پێویستیەك لە هەموو ئەو رۆشنبیریانە دا كە پەیوەندیان بە عەقلی مرۆڤایەتیەوە هەیە.

فەلسەفەی دیكارت لەو عەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت كە لەئەنجامی تاقیكردنەوەی قووڵی مەعریفە و زانیاریدا بەدی هاتووە و ڕووناكیە پرشنگ دارەكەی هەموو جیهانی زەوی و ئاسمانی گرتووەتەوە بەچەشنێك نەوەكانی داهاتوو لەبەر تیشكی ئەو ڕووناكیە پرشنگدارەدا بتوانن مەشخەڵی نەوەكانی داهاتوو لە بەر تیشكی ئەو ڕووناكیە پرشنگدارە دا بتوانن مەشخەڵی ڕێ هەڵگرن لە جیهانی بوون و دروستكراوەكاندا و بیگەیەننە دەروونی مرۆڤایەتی هەرگیز نەمر و كاریگەری بەتین دروست كات لەگەڵ بەختەوەری و ئایدیایی و كامڵ بوونی حەق پەرستی ڕەهادا. لەكاتێكا ئەگەر مرۆڤی هۆشیار بیەوێت بگات بە مەعریفە و ژیری و دانایی بۆ گەیشتن بە بەختەوەریەكی بەشكۆ و بەخشندە و پارێزگاری كردنی لەسەر چەسپاندن و مانەوەی و جێگیركردنی پاڵپشتیەكانی ئاكارە ڕەفتاریەكان لەباوەشی خۆیدا و جەخت كردنەوە لەسەر پاڵشتی كردنی ئاشتی و دڵنیایی لەنێوان تاك و كۆمەڵەكاندا.

یەكێك لە چاكە و بەخشندەییەكانی "دیكارت" ئەم فەیلەسووفە ژیر و دانایە لەسەر هەموو گرۆی مرۆڤایەتی ئەوەیە كە نموونەیەكی بەرز و بڵندە لە بەرجەستەكردنی بوونی مرۆڤایەتیدا و گەڕانەوەی هۆشیاری مرۆڤ بۆ خود و

بوونی خۆی لەم دنیایەدا، بە جۆرێك هەموو ڕاو بۆچوونەكانی دەگەڕێنەوە بۆ بڕیاردان و بیر و بۆچوونێكی ڕوون و ئاشكرا و دیاری ئایدیایی و بەتووندی بەگژ بیر و بۆچوونە چەوت و ناڕاستەكاندا دەچوویەوە كە شیاو نەبوون بەلای خۆی و هەموو خەڵكانیتریشەوە، چونكە دیكارت پرۆگرامە زانستی و فەلسەفیەكانی خۆی دەردەبڕی لەسەر بنچینە و بنەمای دڵنیایی و دەیگەیاندە خەڵك لەسەر قووڵترین و شیاوترین مەعریفە و زانستی ڕاست و دروست بەشێوەیەكی ماندوونەناسانە و زامن بوونی گەیشتن بە حەقیقەتی لە زانستە عەقڵانیەكاندا لە ئەستۆ دەگرت.

بنچینەی ئەو پرۆگرامەی دیكارت نەخشەی بۆ كێشابوو لەسەری دەڕۆیشت لە هەڵس و كەوتی خۆی و شێوازی زانستیانەیدا پێكهاتبوو لە ڕێنمایی و ئاڕاستەكردن و دوور كەوتنەوە لەسەرەتا گشتیەكان و بیردۆزە ناكردەییەكان، هەروەها پرۆگرامی دیكارت بریتی بووە لە ئاڕاستەكردنی كردەیی ڕاست و دروستی عەقڵ بۆ تاقیكردنەوە و ڕۆچوونە ناو قووڵاییەكانی بیركاری و سروشناسی و ئیلاهیات و زانستی پەیوەندیە یەكگرتوەكان.

ئامانجی دیكارت لەشوێنكەوتنی ئەو پرۆگرامەی وا بەهۆیەوە دەركەوت و ناسرا لە ناو هەموو زانایان و پیتۆڵ و فەیلەسوفاندا تەنها چەسپاندنی نەبوو بەسەر یەك زانستدا بەڵكو مەبەستی ئەوە بوو پرۆگرامەكەی گشت گیر و هەمەلایەن بێت و چەسپاندنی بگونجێ بەناوی "وتراوەكان لەبارەی پرۆگرامەوە بۆ سەركردایەتی كردنی عەقڵ لە بڕیارەكاندا و توێژینەوە لە بارەی حەقیقەتەوە لە زانستەكاندا". زیهن ... زەینی عەقڵ.. هەروەك دیكارت ڕەچاوی دەكرد ئەگەر ڕاهات لەسەر داخوازیەكانی پرۆگرامی ڕاست و

دروست ئەوا لە توانایدا دەبێت بیگوێزێتەوە بۆ بوارەكانیتر جگە لە زانستەكانی بیركاری و لە تواناشیدا دەبێت وێنای بیركاری گشتی بكات.

لەوانەیە ئەم بیرو رایە جگە لەهەوڵدانێكی خەیاڵی هیچیتر نەبێت بەوەی كە ئەستەمە هەموو شتەكان بگەڕێنرێنەوە بۆ ژمێرە ( حساب )یان تەنگ و چەڵەمە و كێشە ڕەوشتیەكان و حاڵەتە میتافیزیكیەكان بگۆڕێن بۆ هاوكێشەی جەبری، بەڵام دەشێ بە پێی بیروڕای دیكارت چارەسەری كێشە جیاوازەكان بكرێت بەچارەسەركردنێكی بیركاریانە چونكە لە ڕاستیدا ژمێرە ( حساب ) هیچیتر نیە تەنها هۆكارێك نەبێت كە زانستێكی ژمێرە یان زانستی جەبر بەكاری دێنن بۆ شیتەڵكردنی كێشە تایبەتیەكانی خۆیان. ئەو كاتەی زیهن ڕوو دەكاتە ژمێرە پێویستی پێی دەبێت لە حاڵەتێك لە حاڵەتەكاندا مانای ئەوە نیە وابەستە دەبێت بەو حاڵەتەوە و دەبێتە كۆیلەی ژمێرە، لەكاتێكدا گەر زانستە بیركاریەكان دڵنیاییەكی تەواو و بێناكۆكی تێدا بێت و ئەو دڵنیاییەش لە ڕێگاكانی ژمێرەوە نەهاتبێت كە بەئەنقەست خرابنە ئەو زانستانەوە بەڵكو لە خۆڕسك و بەڵگە نەویستەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەڵگەنەویستی ئەو مانایەی كە بەرهەمیان دێنێت و ڕێكخستنی زنجیرەی ئەو مانایانەی وا لەسەریان دەڕوات.

بۆ ئەوەی بتوانین بەرپەرچی هەر زانستێك بدەینەوە كە دڵنیایی تێیدا یەكسان بێت بە دڵنیایی زانستی ژمێرە یان زانستی ئەندازە ئەوا پێویستە لەسەرمان خۆمان سەرقاڵی هیچ شتێكیتر نەكەین تەنها ئیش كردن نەبێت لەسەر مانا ڕوون و ئاشكرا و جیاكراوەكان ئەو مانایانەی وا ناوەڕۆكێكی بەڵگە نەویستیان هەیە بەمانای بەڵگەنەویستی تەواو، بۆ ئەوەی هەموو ماناكان ڕێك بخرێن یان لەسەر شێوازێكی تایبەت ڕیز بەندی بكرێن بەشێوەیەك هەر

مانایەك لەو مانایانە لەو ڕیز بەندیە دا پەیوەندی هەبێت بە هەموو ماناکانی پێش خۆیەوە.

بێگومان دەبێ ئەو بیر و بۆچوونانە وەلا بخەین کە لەدەسەلاتەکانەوە دەرچوونە جا ئیتر ئەو دەسەلاتە هەر چیەك بێت: فەلسەفی بێت یان کۆمەلایەتی بێت یان سیاسی یان ئایینی بێت، چونکە لەزۆربەی حالەتەکاندا زۆربەی ئەو بیر و بۆچوونانە لەگەڵ هەوا و ئارەزوو دا هاتوونەتە کایەوە و زۆرینەیان شوێنکەوتەی خەیاڵ پلاوە کانیانن و دوورن لە پلە و پایەی دلنیاییەوە، بۆیە هیچ چارەیەکمان نیە تەنها ئەوە نەبێت دوور کەوینەوە لەو بیر و ڕاوبۆچوونانەی وا جەماوەر شەیدایانە و پیادەی دەکەن، چونکە بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی لە درۆ لە بیروبۆچوونە عەقلانیەکاندا سوودمان پێناگەیەنن بێتوو گەر تەنها دەنگەکان حساب بکەین بۆ ئەوەی شوێنکەوتەی زۆرترین ژمارە بین، کۆبوونەوەی زۆرینەی خەلك هەروەك دیکارت ڕەچاوی کردووە بەلگە و سەلماندنێك بەرهەم ناهێنێت کە شانازی پێوە بکرێت بۆ چەسپاندنی ئەو ڕاستیانەی کە دۆزینەوەیان زەحمەتە.

گەواهی دانی تاقیکردنەوە هەستاومریە خەلەتێنەرەکانیش تەنها ئەو حالەتانەن کە پێویستە پشتیان پێنەبەسترێت چونکە ئەوەندەی بۆیان بکرێت هەمیشە بەهەلەماندا دەبەن، لەبەر ئەوەی سەقامگیریەکی وایان تێدا نیە جێگای متمانە بێت و پشتی پێ ببەسترێت.

ئەرکی کردەیی ڕاست و دروست داوامان لێدەکات یان ڕاشکاوانەتر بلێین ئەوە دەسە پێنێ بەسەرماندا کە شێوازە پیادەکراوەکانی لۆژیکی ئەرستۆ وەلاوە بنێین کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا باو بوون، لەگەڵ وەلانانی ئەو پێوانەکاریە لۆژیکیەی بۆ سە پاندنی شتێك پێویستی بەتوێژینەوە هەبوو کە لەبارەیەوە

بزاوتـی زەیـنی سروشـتیدا لەبـەر ئـەوەی بـە پـێچ و دەورەیـەكی ئامێركـاری سـەرقاڵمان دەكـات و ناهێڵێـت خۆمـان بـیر كەینـەوە و ڕێمـان بكـەوێت لـە دۆزینەوەی ڕاستیەكان.

كەواتە مـادەم لـە ئیعتبـار دانانەكا نمانـدا دوور كەوتینـەوە لـە بـیر وڕای دەسەڵاتەكان و بـیر و بۆچـوونە بەناوبـانگـەكان و گـەواهی دانـی هەسـتەكان و ڕێگاكانی پێوانەكاری كۆن، ئەوا هیچ ڕێگایـەكمان لـە بـەردەم دا نامێنێتـەوە تـەنها شـیكردنەوەی زانسـتی بیركـاری نـەبێت ئـەو دوو ڕێگایـەی كـە هـەموو كۆمەڵانی خەڵك بڕیاری لەسەر دەدەن بـەوەی سـەقامگیری و تونـد و تـۆڵی لـە بڕیار و فەرمانەكانی ئەو دووانە دا بەدی دەكرێت بـەڵام دەبـێ بكەوینـە شـوێن شـیتەڵكاری ڕێگاكـانی ئـەو دووانـە نـەك بـە مەبەسـتی چەسـپاندن و جێبەجێكردنیان چونكە وەك دەردەكەوێت لە هەنـدێ مەسـەلەدا چەسپاندن و جێبەجێكردنیان ناگونجێت و ئەنجام نادرێت، بەڵكو بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لێیان لە گرنگترین ئەو شتانەی وا زیهن دروسـتی دەكـات لـە هـەموو هـەنگاو و پلانە بەرنامەڕێژیەكانیدا و هەروەها بۆ ئاشنایی پەیداكردنمان لەسەر كـردە تـاییە تمەندەكانی زیهن كە ئەوەش هاوتـای مەرجە گشـتیە هەمـە چەشـنەكانە تێیدا سوود وەردەگرێت لە هەموو ڕێگاكـانی ژمێرەكـاری یـان ئەنـدازەیی، بـەو ئیعتیبـارەی كـردار گـەلێكی زۆر سـادەن و ژمارەیـان كەمـە. هـەروەك دیكـارت سـەرنجی لێـداوە هـەموو ئـەو كـرداره زەینیانـە كـە دەتـوانین پێیـان بگـەین و دەمانبەن بەرەو پیری زانینی شتەكان بەبێترسان لە نوشستی و شكست بریتیە لە دوو كردار: پەی برن و دۆزینەوە.

بەیروت

١٩٧٩/٥/٢٥ دكتۆر مستەفا غالب

## بەسەرهات و ژیانی دیكارت

ڕینیە دیكارت لە ڕۆژی ٣١ی مارسی ساڵی ١٩٥٦ی زایینی دا لە دایك بووە لە شاری ( لاهای ) لە هەرێمی فەرەنسا كە نزیكەی ٣٠٠ كیلۆمەتر دوورە لە باشوور ڕۆژئاوای پاریسەوە بە دووری پە نجا كیلۆمەتر دوورە لە شاری ( تور ) پایتەختی ( تورین ).

باوكی ناوی ( یواكیم دیكارت )ە كە ڕاوێژكاری دادگای ( بریتانی ) بووە كە ئەو هەرێمەیە دەكەوێتە باكووری ڕۆژئاوای "ئەلتورین"ەوە. بەڵام دایكی ناوی ( جانێ بۆر شار )ە كچی دادوەرێكە لە بەری ( بواتییە ) لە باشووری ( تور ). ئینتیمای دیكارت دەگەرێتەوە بۆ بەرەبابێكی فەرەنسی بۆرژوازی كە ناسراوە بە خانەدانی و بە شەرەف و شكۆداری لەسەرتا پای وولاتدا.

وە نەبێ ( دیكارت ) تاقانەی دایك و باوكی بووبێت بەڵكو برا و خوشكێكی‌تری هەبوو كە هەردووكیان لەم گەورەتر بوون، پاش لەدایك بوونی ( دیكارت ) بە زیاتر لە ساڵێك كوڕێكی‌تریان بوو بەڵام ئەو كوڕە زۆر نەژیا تەنها چەند ڕۆژێك نەبێت لە پاش مردنی دایكی.

وا دەردەكەوێت كە ( دیكارت ) كاتێ دایكی مردووە تەمەنی ئەم تەنها سیانزە مانگ بووە، پاشان نەنكی گرتیە خۆی و هەستا بە پەروەردەكردنی لە گەڵ یەكێك لە شیردەرەكان كە شیری دەدایە و چاودێری دەكرد بە باشترین جۆری چاودێری. دیكارتیش دڵسۆزی بوو بە درێژایی ژیانی. ئەگەر سەرنج بدەین دیكارت زۆر پێداگری لە سەر ئەوە كردووە كە پارێزگاری لە هەواڵەكانی دایكی و دوا سەعاتەكانی كۆتایی بكات، بەوەی كە ئاماژەی بە مردنی دایكی داوە لە

ووتارێكدا كە نووسیوویەتی بۆ شاژن (ئەلیسابات) كە ئەو كاتە تەمەنی دیكارت پەنجا ساڵ بووە.(١)

وە چەند هۆكارێك هەبووە كە تاكو ئێستا كەس نازانێت بۆچی لەوە دا دیكارت بە هەڵەدا چووە كە باسی ئەو هەواڵانە و شیكردنەوەی لە بارەوە كردووە، هەروەها دیكارت چاودێری شاژنە ئەلیساباتی هاوڕێی دەكرد بەچارەسەر كردنی دەروونی ئەو نەخۆشیەی كە تووشی بوو بوو، باسی ئەوەی بۆ دەكرد كە خۆیشی هەمان چارەسەری بەكارهێناوە بۆ ئەو كۆكەیەی كە لە گەڵیا بوو تا تەمەنی بیست ساڵی كە بە میراتی وەریگرتبوو لە نەخۆشیەكی ئازاراوی سیەكانەوە كە بە دایكیەوە بوو لە كاتی سكپڕیەكەیدا بەمەوە و هەر بەو نەخۆشیەشەوە مرد پاش لە دایك بوونی ئەم بەچەند مانگێك.

نازانین بۆچی دیكارت بەراووردی نەخۆشیەكەی شاژنی كردووە بە نەخۆشیەكەی دایكی، تۆ بڵێی ئەم بەراورد كردنە بەڵگە نەبێت لە سەر ئەوەی كە خۆشەویستیەكی بە تینی هەبووە بۆ شاژن. هەروەها لەمەش سەیرتر ئەوەیە كە ئەو هەڵەیەی كردووە كە باسی شێوەی نەخۆشی و مردنەكەی دایكی كردووە پاش لە دایك بوونی ئەم بە زیاتر لە ساڵێك راستەوخۆ پاش لەدایك بوونی برایەكی‌تری كە زۆر نەژیا. لەوانەیە شاراوە بێت لای دیكارت ئەم حاڵەتی لەدایك بوونە وەك چۆن لای شاراوەیە بەسەرهاتەكانی ئەو مردنە. وە لەوانەیە دیكارت لە بیر و بۆچوونی خۆیدا بیەوێ ئەمە لە دەروونی خۆیدا بهێڵێتەوە واتە (مردنەكەی دایكی)، وە لەوانەیە لە هەمان كاتیشدا لە گەڵ ئەو وەفاداریە دا پەیوەستی كاتەوە كە هەیەتی بۆ دایكی ئەو دایكەی كە ئەم نەیناسیوە، وە لە نێوان ئەو هاوڕێیەتیەی كە لەگەڵ شاژندا هەییووە و لە دەروونی ئەمدا جێگەی خوشك و دایكی بۆ گرتووەتەوە.

**دیکارت لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی دا بیرەوەرییەکانی منداڵی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە، لە بارەی ئەو گوندەی کە تیایدا ژیاوە و لە بارەی هەڵس و کەوتی گشتیارەکانەوە، وە لە بارەی جوانی گوندەکانی فەرەنساوە کە بە بۆچوونی ئەو لە وێنەیان نیە لە جیهاندا، بگرە ئەو دابڕانەش لە بیری ناباتەوە کە لە بیست ساڵی کۆتایی تەمەنیدا هەڵیبژارد بۆ خۆی کە لە هۆڵەندا بژی.(٢)**

**دیکارت ڕووداوێك لە ڕووداوەکانی مناڵی خۆی دەگێڕێتەوە بۆ هاورێکەی (شانو)، ڕاو بۆچوونی خۆی بۆ دەردەبڕێت و پێی دەسەلمێنێت کە سۆزداری لە دایك بوو ی ڕووداوەکانی ڕابردووی دوور و هەڵس و کەوتەکانێتی . کاتی خۆی دیکارت کچێکی خۆش ویستووە کە لە تەمەنی خوێدا بووە و خێل بووە، پاشان دوای ئەمە وای لێهات ئارەزووی لە کچێك یان ژنێکی خێل بوو.(٣)**

**ئەم بیرەوەریانەی دیکارت دەیەوێ بینووسێت بۆ هاوڕێکانی بەڵگەی ڕوون و ئاشکران لەسەر ئەوەی کە ئەو پیاوێك بووە چاوی دانەخستووە لەئاستی ڕابردووی خۆی و ڕقی لێی نەبووە، ئەگەر هەڵەشی هەبێت لە بەسەرهاتەکان و تەفسیرەکانیدا، ئەوە خەیاڵی ئەوە کە ئەو ڕابردووەی تۆمار کردووە و خەیاڵێکی دڵخۆشکەر و خۆشەویستە لە دەروونی خۆیدا.**

## ژیانی دیکارت لە قۆناغی سەرەتاییدا:

**توێژەرەوە تووشی بێهیواییەکی گەورە دەبێت کاتێك کە هەوڵ دەدات بۆ زانینی ڕووداوە وورد و تایبە تمەندەکانی ژیانی ئەم بلیمەتە گەورەیە، ئەم فەیلەسوفە دانایە، تەماشا دەکەین کە جیاوازی هەیە لە بارەی بەرواری مێژووی چوونە قوتابخانەیەوە بۆ یەکەم جار، گەر سەرنج بدەین**

مێژوونووسەكەی ( بابیە ) ئاماژە بەوە دەكات كاتێ كە چووەتە قوتابخانەی ( لافلیش ) ـ بۆ ئەوانەی كە باوكیان یەسوعیە ـ لە نیسانی ساڵی ١٦٠٤ دا بووە یان دوای چەند مانگێكی كەم لە كردنەوەی ئەو قوتابخانەیە بووە، بەڵام ڕاستی و دروستی مێژوویی وا لە نوێترین مێژوونووسانی دیكارت دەكات كە ساڵی چوونە قوتابخانەی تۆمار بكەن بە ساڵی ١٦٠٦. ئەگەر پاڵپشتی ئەم ڕایە بین ئەوا مێژووی دەرچوونی لە قوتابخانە لە ساڵی ١٦٤١ دا بووە بەشێوەیەكی دڵنیایی، چونكە ناچێتە عەقڵەوە كە زیاتر لە هەشت ساڵ مابێتەوە لە قۆناغی سەرەتایی دا، ئەمە لە كاتێكدا ئەگەر ئیحتیمالی ڕاستبوونی نەبێت، یان دووبارەكردنەوەی ساڵێك لە ساڵەكان لە پۆلەكاندا، هەر چەندە مێژوونووسەكانی باسی ئەوەیان نەكردووە كە بۆ ماوەی ساڵێك خوێندنەكەی پەكی كەوتووە بە هەر هۆیەك بێت لە هۆیەكان دیكارت خۆی بە ڕوون و ڕاشكاوی بۆمان باس دەكات لە بارەی خوێندنەكەی و بەرنامە نووسیەوە لە كتێبی"وتارێك دەربارەی میتۆد " بەڵام ئەم كتێبەی نەنووسی تاڵەساڵی ١٦٣٧ دانەبێت كە نووسی واتە دوای چارەكە سەدەیەك لە مێژووی دەرچوونی لە قوتابخانە. دیكارت لە سرووشتی خۆیدا مێژوونووسی ڕووداوەكانی جیهان نەبوو، وە مێژوونووسی ڕووداوەكانی خۆیشی نەبوو. وە ئەو ووتارەش لە بۆچوونی خۆیدا تۆمارێكی مێژوویی نەبووە، بەڵكو ئەوە پێش هەموو شتێك دەربڕینێكە لەبارەی بڕیاردانیە وە لەسەر ڕۆشنبیری ئەقڵی بە شێوەیەكی گشتی، وە لە سەر ئەو ڕۆشنبیریەی كە خۆی وەریگرتووە بە شێوەیەكی تایبەت، لە دەقی ووتارەكە و شێوەی نووسینی بۆمان دەردەكەوێت، كە قوتابخانەكانی ئەو ڕۆشنبیریە بریتیە لە چەند نموونەیەك كە نرخ و بەهای هەمیشەیی خۆی هەیە.

بە دڵنیاییەوە دیكارت بڕیاری لەسەر ئەو ڕۆشنبیریە داوە كە وەریگرتووە لە قوتابخانەی سەرەتاییدا، بەڵام ئاماژەپێدانی قۆناغەكانی زۆر بە وردی ڕاست و دروست نین لە ڕووی مێژوویی‌یەوە، وە خەیاڵیش نین، ئەوەی كە پشتی پێ دەبەستین یارمەتیمان بدات بۆ پێكهاتەی ڕوانینێكی دروست لەبارەی ئەو ڕۆشنبیریەی كە دیكارت وەریگرتووە، دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی "لافلیش"ی یەسوعیەكان و ماوەی مانەوەی لەوێدا وە لە ڕووی ئەدەبیەوە ئەو ڕۆشنبیریە قوتابخانەییەی سوعیەكان گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە تا ئەم سەدەیەی ئێستاش، وە هەر لە سەر ئەو بنچینەیەش ئەدەبی فەرەنسی كلاسیكی بنیات نراوە. وە شێوازی زمان و داڕشتن و نووسینی فەرەنسی لێیەوە دەرچووە تا ئەمڕۆش، ئەم ڕۆشنبیریەش لە سەر دوو قۆناغ بنیات نراوە: یەكەمیان، وێژەیی زمانەوانیە، ئەویش خوێندنی كتێبەكانی یۆنان و ڕۆمانیە كۆنەكانە بە زمانە ڕەسەنەكەی خۆیان، دووەمیان، قۆناغی لێكۆڵینەوەی ئاوەز و ژیری پوختە كە زۆربەی بنیات نراوە لە بابەتە فەلسەفیەكان، وە كەمێكیش لە زانستی بیركاری.

قۆناغی یەكەم دابەش دەبێت لەسەر ئاستی تەمەنی قوتابی و ڕێژەی خوێندەواری و پلەی پێگەیشتنی بۆ دوو ماوە، یەكەمیان خوێندنی دەرسەكانیان لەبارەی چیرۆكەكان و مێژووی یۆنان و ڕۆمانەوەیە.

ماوەی ئەم خوێندنەش دەگاتە سێ ساڵ، پاشان دەگوازرێتەوە بۆ ماوەیەكی نوێتر كە ئەمیش لە سێ ساڵ زیاتر تێناپەڕێت، كە لەماوەی ئەو سێ ساڵە دا دەرسەكانی ووتاربێژی و شیعری پێشینیەكانی تێدا دەخوێنرێت.

وە لە كاتێكدا ئیتر قوتابی بەرز دەبێتەوە بۆ قۆناغی دووەم كە تێیدا دوو ساڵ بەردەوام دەبێت و لە ساڵی یەكەمدا مەنتیق و بیركاری دەخوێنێت و لە ساڵی دووەمدا خوو و ڕەوشت و سرووشت و ئەودیوی سروشت دەخوێنێت.

وەسفەكانی دیكارت جیاوازی نیە ئەوەی كە لە ووتارەكەیدا نووسیویەتی لە گەڵ ئەو بەرنامەیەی كە ئاماژەمان پێدا لەمەو پێش. ئەویش دەست پێدەكات بە چیرۆك و مێژوو و پاشان دەگوازرێتەوە بۆ شیعر و ووتار، وە كۆتایی دێت بە بیركاری و فەلسەفە. بەلام ڕا و بۆچوونی لەو رۆشنبیریەدا بێگومان دەبێ بە چاوی ووریایی و ترسەوە تێی بڕوانین.

دەگونجا كە لە توانایدا بووایە هەستی بە جیاوازیەكانی ئەو رۆشنبیریە بكردایە ئەگەر بێتوو بهاتایە یەكسەر پاش كۆتایی ئەو خوێندنە بووایە یان پاش دەرچوونی لە قوتابخانەی ناوبراو بوایە. بەلام پاش ساڵانێكی دوور و درێژ لە دەرچوونی لە قوتابخانە توانی گرێی بداتەوە بە شێوەڕاستەقینەكەی خۆیەوە ئەو بابەتانەی كە دەیویست لە فەلسەفە و زانست و رۆشنبیری بە شێوەیەكی گشتی.

گەر سەرنج بدەین دەبینین كە دیكارت ئامانجی ئەوە نەبوو كە لە پشت قسەكانیەوە لە قۆناغی رۆشنبیری وێژەیی (ئەوەی كە پێیدا تێپەڕی لەماوەی خوێندنی یەكەمیدا) كە ڕەخنە بگرێت لە بەرنامەكانی ئەو قۆناغانە، بەڵكو ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە ئەوەی خوێندوە بە خوێندنێكی تەواو، بە تایبەتی بابەتەكانی چیرۆكی و مێژوویی.(٤) پاشان سەرپێچی لە شیعر و وتاربێژی ناكات و چێژی وەرگرتووە لە جوانی و ڕازەوەییەكان و كاریان تێكردووە لە ژیانی دەروونندا.(٥) بە هۆی گرنگی دانی یە سوعیەكان بەو ماددانە لە

قوتابخانەكانی فەرەنسا دا زاڵ بوون بەدی دەكرێت بەسەر هەموو خوێندن و لێكدانەوەكانی تردالە چوارچێوەی هەموو ئەوروپادا.

سەرباری ووردبوونەوە لە تێگەیشتنی دەقەكۆنەكان : زمان و ڕەوانبیژی و ئەدەب، ئەم خوێندنە تایبە تمەندی ئەوە بوو كە قوتابی ئاراستە دەكرد بەرەو شێوازی پێویست لە دەربڕینی زارەكی و نووسیندا، وە بە ئاراستەكردنی عەقڵ و خوو و ڕەوشت و سروشت و هەڵس و كەوتی دەرەكی قوتابیان بەرەو چاكتر و بەئەزموونتر و كاملتر، دەردەكەوێت كە قوتابی هەموو دەقە كۆنەكان ناخوێنێتەوە، بەڵكو هەڵبژاردەیەكیان لێ دەخوێنێتەوە كە بگونجێت لە گەڵ تایبە تمەندیەكان و تەمەنی ئەو دا، وە ئەو كۆمەڵگایەشی كە تێیدا دەژی و ئەو ئایینەشی كە لەسەری دامەزراوە. وە خوێندنی زمانە كۆنەكان خوێندنێكی ئاراستەكەرە لە ڕووی ئەدەبیەوە، پاشان لە ڕووی مەعنەوی و ڕۆحی و عەقلانیەوە.

كاریگەری خوێندنی ئەدەبی یۆنانی بە روونی دیارە لە پەرەپێدانی خەیاڵی ئەدەبیدا، بەڵام كاریگەری ئەدەبی لاتینی دەردەكەوێت لە چەسپاندنی شێوازی دەربڕین و مل كەچكردنی بۆ ووردەكاریەكانی ئەدەبی لاتینی كە دێتە گۆڕێ لە مەیدانی ئەدەب و زمان، ووردەكاری جەبر و ئەندازەیان ووردەكاری خودی یاسای ڕۆمانی. یەسۆعیەكان لە رووی ئەدەبیەوە زیاد و كەمی پێوە نانێن كاتێك كە خەیاڵ ڕووبەڕووی پەندی ( شكۆمەندی و هێز ) دەبێتەوە لە چیرۆك و ئەدەبیاتەكانیدا، هەستیش بە ڕێك و پێكی و تۆكمەیی لە داڕشتنی شێوازیاندا دەكەیت، وە لە بەر ئەوەشە كە یەسوعیەكان لایان وایە بیر و باوەڕی ئەدەبی كلاسیكی و پەندە بەنرخەكانیان زۆر كاریگەرن، یەكێتیەك پێك دێت لە نێوان : ( شكۆمەندی بەیاسا و دەستوور،

هێزیش بە ڕێگای عەقڵ). بەڵام لە ڕووی مەعنەویەوە مەبەستیان پەروردەکردنی دەروونە (نەفسە) و ڕاهێنانیەتی لەسەر ئازایەتی، بەو پێودانگەی کە پاڵەوانەکانی یۆنان و ڕۆمان نموونەی دیاری ئەم کارەن، وە هەروەها لەسەر گوێڕایەڵی و بە فەرمان دەرنەچوون، وە جێبەجێکردنی ڕێنماییە فێرکاریەکان، وە هەروەها شێوازی ڕۆمان لە دەسەڵات و شەڕ و نووسینیشدا نموونەی بەرجەستە و دیارن لە گوێڕایەڵی بە هەموو شتە بەهادارەکانی خوو و ڕەوشت و پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکانەوە.

بەڵام ئامانجیان لە پشتەوەی ئازایەتی و گوێڕایەڵی بۆ فێربوون و ڕاهێنانە لەسەر ئیرادە کە، بووە بە ئامانجەکانی یەسوعیەکان بە شێوەیەکی گشتی. بۆیە دیکارت دەبینی کە ئەو مامۆستایانەی زۆر توند و پێداگیر بوون لە سەر "ڕاستی"، هەمیشە قوتابیەکانیان تێگەیشتوو بوو، زۆر دەنگی بەرز نەدەکردەوە، خۆی هەڵنەدەقورتاندە ناو قسەوە، لەیاسای قوتابخانە دەرنەدەچوو، ڕاهاتبوو لە سەر گوێڕایەڵی، لە کەش و هەوایەکی ئازادی ڕەها دا.

وە ئەگەر هەوڵماندا بگەینە بۆچوونێکی ڕاست لەبارەی ئامانج لە ڕازاندنەوەی هەر دوو پەسەندێتی (ئازایەتی و گوێڕایەڵی) لە تاکدا ئەوا دەزانین کە ئاراستەکاریەکانی یەسوعیەت مەعنەوی ڕەووشتکارین پێش لە هەر شتێکیتر، بەڵکو ئایینین بە مانایەکی ڕاستر بۆ ئەم ووشەیە، وە ڕامیارین لە هەندێ شتا، وە هەوڵدانێکە بۆ گونجاندن لە نێوان ئەدەب و ڕەووشتی یۆنان و ڕۆماندا، وە لە نێوان ئەو سەپاندنەی کە ئایین و حکومەت لە ئەرکەکان و یاساکاندا سەپاندوویانە.

لەم رووەوە دەبینین رۆشنبیری ئەدەبی لە کتێبەکانی یۆنان و رۆماندا ئاراستەکردنێکی چالاك و کاریگەرە بەرەو گوێرایەڵی کردنی مەلیك و مل کەچ کردن بۆ خواوەند و کەنیسە. وە لە ووتارەکەی دیکارتدا بەرچاو دەکەوێت یەکەمین پایەکانی رەوشت لە سەر دەرخستنی دەقی ئەو مەبەستەیە کە دەبێ فەیلەسوف مل کەچ بێت بۆ یاسا و عادات و تەقالیدی شارەکەی و لەسەر ئەو ئایینەش بمێنێتەوە کە خوا خەڵاتی کردووە بە سەریدا.( ٦ )

ئاشکرایە پاش هەموو ئەو شتانەی ئاماژەمان پێدا دیکارت دەبێتە سەردەستەی پیاوانی ئەدەبی فەرەنسی لە سەدەی حەڤدەهەمدا کە پارێزگار و شوێنکەوتووە لەو یاسا و رێسایانەی کەبینیمان، بەڵام لە ئازادیدا، مامۆستاکانی لەوە زیاتر لێیان داوا نەدەکرد، بەڵکو لەوە زیاتریان فێر نەکرد.

لەبەر ئەوە هەست بەو بەریەککەوتنەی هەڵوێستەکانی دیکارت دەکەین لە گەڵ ئەو رۆشنبیریە ئەدەبیەی ئەوان و رادەی کاریگەریەکەی لەسەری. بەڵام رەخنەکانی لە رۆشنبیری عەقڵی هەر دوو لایەنی بیرکاری و فەلسەفیەوە، هەر وەکو زانراوە زۆر تیژ و جەرگ بڕ بووە، بەڵام لانی کەم پێویست بوو لە بەر رێز و نرخداری هێندەی ئەو ئەندازەیە سەرزەنشتی بکردنایە کە مامۆستاکانی فێریان کردبوو ئەوە جێگەی سەرنجە کە دیکارت بابەتەکانی بیرکاری خوێندووە چاکتر لەمامۆستاکانی و پێکەوە لە گەڵ ئەواندا کتێبی ( کلافیۆسی یەسوعی )یان خوێندووە کە بە کۆڵەکەی جەبر دادەنرێت لەوسەردەمە دا، هەروەها جەبری خوێندووە دووبارە سەرەرای بیرکاریە تەقلیدیەکان لە ئەندازە و ژمارە و گەردووناسی و مامۆسیقا. وە ئاماژەکانی دیکارت خۆی لەم خوێندنانەیدا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پەرۆشی زیاتر هەبووە بۆ زانستەکانی

بیرکاری بە شێوەیەکی تەواو چڕ و پڕ و کاملتر لەوانیتر. سەرەڕای ئەمەش هەڵساوە بە تەواو کردنی چەسپاندنەکرداریەکانی لە بواری ڕوو پێوی زەوی یان پیشەسازیە میکانیکیە ناسراوەکان.

دیکارت دانی نابوو بەو توانا تیۆریەی کە لە زانستی بیرکاریدا هەییوو لە یەسوعیەکان چێژی وەرگرتبوو، بەلام رەخنەی دەگرت لە ئاستەنگی چەسپاندنیدا.( ٧ ) لەوانەیە بە پێی بیر و باوەڕی دیکارت ئەو چێژەی کە مژیویەتی و پێی گۆشکراوە بەوەی حساب ناکات کە بریتی بێت لە بەشە کورتکراوەکانی ئەو بیر و باوەڕی ( مەزهەب )ەی کە "تۆما ئەکوینی" دۆزیویەتەوە و تێیدا ژیری و دانایی ( ئەرستۆ )ی تەفسیر کردووە بەتەفسیرکردنێکی مەسیحیانە.

ئەوەی کە زانراوە لە کەنیسەی کاسۆلیکی ئەوەیە لە هەموو نزا و وێردەکانیدا قوتابخانە و زانکۆ مەسیحیەکان ئامۆژگاری دەکەن بۆ شوێنکەوتنی بیر و باوەڕی "تۆما ئەکوینی" لە فێربوونی فەلسەفە و لاهووتدا.

بەلام نابێ لەو قسەیەش دەرچین کە دەڵێ: یەسوعیەکان نەیان سەپاندبوو بەسەر قوتابیانی قوتابخانەکانیاندا پێویستی وەرگرتن و بەدواداچوونی ناوەڕۆکی پۆلێن کاریەکانی "ئەرستۆ" یان "تۆما ئەکوینی" بە بەلگەی ئەوەی کە هەر کەسێك پشت دەبەستێت بە فەلسەفەی دیکارت لەو لایەنانەوەی کە تێیدا نزیکە لە مامۆستاکانی، ئەوا ئەو کارتێکردنەی تیا نیە کە فەلسەفەی "ئەرستۆ" یان "تۆما ئەکوینی" کردبێتیانە سەری. وە زۆربەی یەسوعیەکان گرنگی نادەن بە فەلسەفەی "ئەرستۆ ئەکوینی" لە "تاقیکاری"

و "پەیوەندی بەبوون"ەوە، یان لە ئەقڵی مرۆڤ و پەیوەندی بە هەستەوە، یان لە بوونی پەیوەندی لە نێوان "خود و بیر وباوەڕی یەكەم".

گەر سەرنج بدەین دەبینین كە ئەوان بەوە دڵیان ئاو دەخواتەوە كە گەڕانەوەی بیر و باوەڕی "ئەرستۆ ئەكوینی" دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ لەمانا فەلسەفیە سەرەكیەكان، وەك ماناكانی ناوەڕۆك (جەوهەر) و وێنە، ماددە و سروشت، وە جۆرەكانی هۆكاری جیاواز، جۆرەكانی جوڵە، وەك ئەو دەقەی ئەرستۆ كە لەسەر ئەمە هاتووە لە سروشت و ئەودیوی سروشت.(٨)

كاتێك دیكارت ویستی كتێبەكەی "بنەماكانی فەلسەفە" بڵاو بكاتەوە و تێیدا بەراووردی هەر بڕگەیەك لە گەڵ بڕگەیەكی هەڵبژێراوی نووسەرێكی فەلسەفی ناسراوی قوتا بخانە دابكرێت، بۆ دەرخستنی پەسەندێتی فەلسەفەكەی بەسەر فەلسەفەی قوتابخانەییدا، دەبینرێت كە گرنگی نەدان بە بیر و باوەڕی "تۆما ئەكوینی" بۆتە هۆی وونبوونی گیان و ژیانی لە لایان.

وە دەبێ ئاماژە بۆ ئەو رەخنە راستەوخۆیەی دیكارت بكەین كە لە "وتارێك دەربارەی میتۆد" دا ئاراستەی ئەو فەلسەفەیەی كردووە كە فێری بووە، وە دەبینین كە ئاماژەی نەكردووە نە بۆ "ئەرستۆ" و نە بۆ "تۆما ئەكوینی" وە نە بۆ هیچ تیۆرییەكی روون و كامڵ كە بە كورتی و پوختی پێكهاتبێت لە وانە فەلسەفیەكان.

ئەمەش مانای ئەوە دەگەیەنێت كە یەسوعیەكان پێش هەموو شتێك دوو فاقن لە فەلسەفەدا، بەوەی كۆك و تەبان لە هەندێ لە بڕیارەكانی دەرچووی سەر بە "تۆما ئەكوینی" و هەندێكیتریش كە لە لایەن "دانزسكوت"ەوە دەرچووە یان جگە لەم دووانەش لە هەندێ لەوانەی كە دەرچووە لە لایەن

مامۆستاكانی قوتابخانەوە، ئەمەش بە دیار دەكەوێت لە كاتی خوێندنەوەی كتێبەكانی یەكەمین مامۆستایان كە "سواریز"ە.

دیكارت رەخنەی توندی گرتووە لە فەلسەفەی مامۆستاكانی و بە خەوش و كەم و كوڕی حساب كردووە لەسەریان ئەو پشت بەستنەی كە لەسەر ووتوێژی پڕوپوچ و لێكۆڵینەوەی نەزۆك لە نێوان تیۆرە جیاوازەكاندا كە ناكرێت هەموویان راست بن، لە یەك كاتدا و، لەیەك بابەتدا، وە توێژینەوەكانیش وەك ئەو هەوڵدانانە نەبووە كە پارسەنگی تیۆریەك بداتەوە بە سەر تیۆریەكی‌تردا، لەو گۆشەنیگاوەی كە نەیان هێشتووە عەقڵ بە هەموو ئازادی و سەربەستیەكی خۆیەوە بگاتە چێژی مەبەست. ئاستی پەسەندێتی بڕیارە تیۆریەكانیان دەست نیشان كردووە بە بێ‌ئەوەی كە لەسەر دڵنیاییەكی تەواو بن لە هیچ شتێكدا. بەم جۆرە فەلسەفە قوتابخانەیەك دەبێت لە گومان و هیچی‌تر پێش ئەوەی كە ببێتە قوتابخانەیەك بۆ زانست و دڵنیایی.(٩)

بەڵام لە مەیدانی فەلسەفەی كردەیی یان رەوشتیدا دەردەكەوێت كە وانەكان كورتكراونەتەوە لە سەر خوێندنەوەكانی هەڵبژاردەی كتێبی ڕەواقیەكان بەبێ‌ئەوەی كە لە گەڵ ئەو خوێندنە وانە و ڕا و بۆچوونی مامۆستاكان لە سەر ئەو خوێندنەوانە دا هیچ پەیوندیەك هەبێت بەو ژیانە كرداریەی كە دیكارت دەیەوێت هێلكاریەكەی بكێشێت بۆ دیاریكردنی ڕێگا و چەسپاندن و پێداگری لە سەری. بەڵكو هەر لەوانەیە مەبەستیان لە سەپاندنی لە دژی ئەو ڕەخنەیەی دیكارت بێت كە دەیگرت لەو فەلسەفەیەی كە فێری بووە و لە پاڵ ئەمەشدا ئەو رەخنەیەی كە دەیگرت لە بیركاری، وە بە شێوەیەكی گشتی بۆی بڕوانین لەو رەخنەیەی كە دەیگرت لەو رۆشنبیریە عەقلیەی وا فێری بووە، وە كەم و كوڕیەكانی زانستی بیركاری وا خوێندبووی،

ئەوەیە کە ئەو وانە یخوێندبوو بشێت بۆ چەسپاندنێکی گشتی و سەرتا پاگیری لە هەموو ڕووەکانی ژیان و کردارەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو زانستە بەرتەسك و سنووردارە. ناتەواوی و کەم و کوڕی فەلسەفە لەوە دایە کە نەبێتە هۆیەك بۆ دوورخستنەوەی مرۆڤ لە هەڵە و بنکەیەکی واش نەبێ کە مرۆڤ بتوانێت لە ژیاندا خۆی لە سەر جێگیر بکات.

وەك دەبینرێت دیکارت خۆی پاراستووە بۆ ئەوەی راستی لە هەڵە جیا کاتەوە و شتەکان بە ڕوونی ببینێت و بە پێداگیری چەسپاوەوە رێبکات.

وە لەم بۆچوونەی دیکارتەوە ئەوە بەدی دەکرێت کە خەوش و کەم و کوڕی جەوهەری لە قۆناغەکانی ئەو رۆشنبیریە کرداریە دا حیکمەت لە چەمکی راستی نیە، لەرووی تیۆریەوە دڵنیایی تیا نیە، چەسپاندنیش سنوردار و زۆر بەرتەسکە، بەڵام فەلسەفەی راستەقینە ئەوەیە کە باس لە ژیری دەکات، وە لە کارەکانی ژیریش ئەوەیە کە ئەبێ ڕووناکیەکی پڕشنگدار بێت بۆ مرۆڤ و ببێتە پێشەنگی لە ژیانی عیرفانیەوە بۆنموونەیی و کامڵ بوون.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە دیکارت پاش دەرچوونی لە قوتابخانەی یەکەمینی (سەرەتایی) لە لافلیش، بە راشکاوی رەخنەی بنەڕەتی نەگرتووە هەر وەك ئاماژەی پێداوە لە "وتارێك دەربارەی میتۆد" بەڵکو پاش ئەو کاتە چارەکە سەدەیەکی خایاندووە.

بەڵام ئاماژەکردنەکە جۆرێك لە یادەوەری بێهیوایی هەڵگرتووە کە لە کاتی تەواوکردن و دەرچوونی لە قوتابخانە هەستی پێکردووە. تەنانەت نەیتوانیوە خۆی لێ دوور بگرێت هەتا ئەو کاتانەی کە سەرکۆنەی تێدا دەست پێکرد بە رەخنەگرتن لە زانست و فەلسەفەی قوتابخانە، بە پێی ئەو دانپیانانەی کە دەڵێ باشترین رۆشنبیریم وەرگرتووە لەیەسوعیەکان کە

پێویستە گەنج وەربگرێت، وە خۆی بە قەرزاری مامۆستاکانی دەزانێت بەرامبەر بە وەرگرتنی تۆوی فیکر و بیرکردنەوەی، بەڵکو دەگاتە ئەو رادەیەی کە ئامۆژگاری هاوڕێیەکی دەکات کە کوڕەکەی بنێرێت بۆ قوتابخانەی یەسوعیەکان.( ١٠ )

پاش ئەوەی دیکارت قوتابخانەی ( لافلیش )ی بەجێهێشت لە هاوینی ساڵی ١٦١٤ی زایینیدا یان ڕاستر بڵێین پاش ئەوەی تەمەنی لە هەژدە ساڵ کەمێ تێپەڕ ببوو، پاشان لە زانکۆی ( بواتییە ) لە ساڵی ١٦١٦ دا بڕوانامەی بەکالۆریۆس و لینسانسی لەمافەکاندا بەدەست هێنا، دیکارت ناوی خۆی نووسی لە تۆماری پارێزەراندا هەر لەو کاتەوەی بڕوانامەی بەدەست هێنا و هەرگیز لێی جیا نەدەبوویەوە. لەساڵی ١٦٢٢ دا بیری کردەوە لە کڕینی کارێکی قەزائی ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە سەربەخۆییەکی دارایی بەدەست هێنابوو، پاشان دوای ماوەیەك دوور کەوتەوە لەو جۆرە بیرکردنەوەیە.

دیکارت پاش دەرچوونی لە قوتابخانەی ( لافلیش ) لاوێکی کۆمەڵایەتی لێدەرچوو هەر وەك بەخوێندنەوەی مێژووی ژیاننامەکەیدا دەردەکەوێت، حەزی لە سەما و یاریکردن بەشمشێر بوو. پاشان باوکی پیشەیەکی ئەفسەرێتی بۆ کڕی، لەسەر عادەتی خانەدانەکانی ئەو سەردەمە، پاشان لەساڵی ١٦١٨ دا دیکارت بوو بەئەفسەر لە سوپای مۆریس دی ناسۆی هۆڵەندی و هاوپەیمانی فەرەنسا. دیکارت لە شاری ( بریدا )ی هوڵەندیدا ماوەیەك ژیا و لەو ماوەیەدا ( ئیسحاق بیکمان )ی ناسی کە ئەو کەسە بوو گەورەترین کارتێکردنی هەبوو بۆ دیکارت لە ڕووبەڕوو بوونەوەیدا بەرامبەر بە ئاڕاستەکردنێکی زانستی. ( بیکمان ) هەشت ساڵ لە دیکارت گەورەتر بوو، لەو کاتەشدا جگە لەوەزیفەکەی خۆی وەکیلی قوتابخانەیەکی ئامادەیی بوو، وەزیفە و پیشەکەی

**خۆشی بریتی بوو لە بیركاری و زانستەكان و زانستی سروشتناسی بەجۆرێكی تایبەت، لە توێژینەوەكانیدا ڕووی دەكردە گێڕانەوەی (لێكدانەوەی) دیاردە سروشتیەكان بەلێكدانەوەیەكی بیركاریانەی میكانیكی گشتی، نزیك لەو ڕێگایەی كە (گالیلۆ) گرتبوویە بەر لە هەمان كاتدا. بێگومان دیكارت شتی زۆری لێوە فێر بوو لەو ماوەیەی وا لە گەڵیا دەژیا لە شاری (بریدای) هۆڵەندی ئەمەش بە پێی بەڵگەی ئەو وشانەی كە بۆی نووسیوە لەو كاتەدا: "لە ڕاستیدا تۆ تەنها كەسێك بوویت كە منت بێدار كردەوە لە خەوی بێئاگایی، گەڕامەوە بۆ دەروونی خۆم و هۆشم هاتەوە بەبەردا، عەقڵ و ئاوەزی خۆم گەڕاندەوە بۆ گونجاوترینی ئیش و كارەكانم پاش ئەوەی كە هەموویانم فەرامۆش كردبوو". هەروەها بەڵگەیەكیتریشی بەدیار دەكەوێت ئەویش ئەوەیە دیكارت یەكەمین كتێبی كە دایناوە بەناونیشانی "پوختەی مۆسیقا" پێشكەشی ئەوی كردووە لە پێشكەشكردنەكەشیدا تكای لێ دەكات كە پارێزگاری كتێبەكە بكات لای خۆی مادام ئەو بەشێوەیەكی ڕاستی و كردەیی هاوڕێ و خۆشەویستی ئەوە.**

**ئەو كاتەی دیكارت لە هۆڵەندا بوو كاتەكانی بێئیشی خۆی بەسەر دەبرد لە خزمەتی سەربازیدا بە وانەخوێندن و بەدەست هێنانی زانست بەتایبەتی لەوانەی بیركاریدا، هەر بەتەنیشت ئەم كارەشیەوە خەریكی خوێندنی زمانی هۆڵەندی بوو سەرەڕای خەریك بوونی بەكاری وێنەگری و ساختمانە جەنگیەكان. دیكارت لە هۆڵەنداوە ڕووی كردە ئەڵمانیا. ئەو كاتە بوو كە ماوەی (٣٠) سی ساڵ بوو شەڕ باڵی كێشابوو بە سەر ئەڵمانیادا، خۆی خزاندە ڕیزەكانی ئەو سوپایەوە كە هەڵبژێراوی باڤاریا مۆڵی دابوو بۆ كوشتنی بۆهیمیای شۆڕشگێڕ.**

پاش ماوەیەك ڕووداوێك هات بەسەر دیکارتدا کە گەورەترین کاریگەری هەبوو لە هەموو ژیانیدا: ئەوەش لەماوەی سالانی ١٦١٩ـ ١٦٢٠ دابوو کە لەو کاتەدا لەشاری "نۆیبرگ"ی کەناری (دانوب) دادەژیا. قەیرانێکی عەقلی هات بەسەریدا و خۆی گۆشەگیر کرد. خووی گرتبوو لەسەر تێڕامان و خۆخەریك کردن بە بیرکردنەوە لەو مەترسیانەی هاتبوونە ڕێگەی تیۆریە گشتیەکەی لە مەنهەجی توێژینەوە لەزانستەکان. دیکارت خۆی لەم بارەیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "ئەو کاتەی لە ئەڵمانیا بووم، کە هێشتا شەڕی تێدا کۆتایی نەهاتبوو، لەکاتی گەڕانەوەمدا لە ئاهەنگی چونە سەر تەختی پادشایەتی ئیمپراتۆردا، لەسەرەتای ئەو زستانە دابوو ڕووم کردە گوندێك هیچ شتێکی تێدا نەبوو بۆ دەمەتەقێی شەوانە، وە بۆ چارەڕەشی من هیچ شتێکم پێ نەبوو کە خۆمی پێوە خەریك کەم و حەز و خولیاکانمی پێ دابین بکەم، لەبەر ئەوە خۆم بەند ئەکرد بە درێژایی ڕۆژ بە تاقی تەنها لە ژوورێکی گەرمدا بە شێوەیەك هەموو بۆشاییەکانی ژیانم تەرخان کردبوو بۆ لێکۆڵینەوە لە دەروونی خۆم و تاوتوێکردنی مەترسیەکانی فیکری خۆم".

لەم لێدوانە دەروونیەی دیکارتدا دەردەکەوێت ئەوەی کە ئاماژەی بۆ دەکات تێڕامانێکی لەسەرخۆ و شلەتێن نیە هەر وەك دەگونجێت ئەمە پێشینەیەك بێت بۆ وەهم و خەیاڵ، لەسەر ئەو بەڵگەیەی کە لە یەکێ لە پارچە ئەدەبیەکانی "بابیە" لەو نامیلکەیەی کە ناوی "ئۆلمبیقا"یە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لێدوانەکانی دیکارت لە دەروونی خۆی و ڕۆچوونەکانی بۆ ناو تێڕامان و بیرکردنەوەکانی لەو ڕۆژەدا تێکەڵ بووە لەگەڵ وروژانێکی دەروونی سەرسوڕهێنەردا. بۆ نموونە ئەگەر گوێی لێ ڕابگرین دەڵێت: دەی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩١٩: چی لەمە زیاتر توندتر و کاریگەرتر دەبێت بۆ باڵگرتن و

هەڵفڕاندنی دەروونم بەشێوەیەكی حەماسی و جۆش و خرۆشێكی وا كە مەگەر هەر لە بنەماكانی زانستی سەرسورهێنەردا بدۆزرێتەوە!( ١١ )

لەم حاڵەتەی كە بە "تالیهاتنی عەقلی"دا دەنێین هات بە سەر دیكارتدا ئیتر دیكارتی تەسلیم بە خەوتن كرد، وە لەو خەوەدا سێ خەونی بینی: لە خەونی یەكەمیدا دەڕۆیشت بە ڕێگادا و لەناكاو لەو ڕۆیشتنەیدا هەستی كردووە بە تۆقان و ترس و لەرزێكی زۆر توند كە بوونەتە هۆی لەدەست دانی تەوازنی ( هاوسەنگی )، كوت و پڕ بە پەلە هەوڵی داوە بۆ گێڕانەوەی ئەو تەوازنەی.

ئا لەو كاتەدا بایەكی توند یەكسەر لاشەی هەڵدەگێڕێتەوە و لەسەر پاژنەی پێ دەیكوتێ بە زەویدا، وەك بڵێی بگەڕێت بەدوای شتێكدا بۆ دۆزینەوەی قوتابخانەكەی تا نوێژێ بكات لە كەنیسەكەیدا. بەڵام لەكاتی چوونە ژوورەوەیدا بیری دەكەوێتەوە كە لە كاتی گەڕانەوەكەیدا بەڕێگا دا تووشی پیاوێك هاتووە كە ناسیویەتی، بۆیە خێرا دەستبەجێ لەكەنیسەكە دەردەپەڕێتە دەرەوە و دەگەڕێت بە دوای كابرادا تا سڵاوی لێ بكات، بەڵام ڕەشەبایەكی بەهێزتر لەوەی پێشوو پاڵی پێوە دەنێت و دەیكێشێت بەدیواری كەنیسەكەدا، ئا لەوكاتەدا پیاوێكی تر دێت بۆلای و زۆر بەڕێز و ئەدەبەوە داوای لێدەكات وەك هاوڕێیەكی پێشوازی لێبكات و داواشی لێدەكات دیاریەكی بەنرخی پێشكەش بكات، لەو كاتەدا دیكارت گومانی بۆ ئەوە دەچێت ئەو دیاریە هیچ شتێك نیە تەنها شەمامە ( گوندۆرە )یەك نەبێت كە لە دەرەوەی وڵات دەبێ بیخوازێت. بەم شێوەیە دیكارت لە درێژایی خەونەكەی دا سەری لەوە سوڕمابوو كە هەموو خەڵكی دەتوانن پارێزگاری لە تەوازنی خۆیان بكەن تەنها ئەو نەبێت ناتوانێت.

لەکاتێك دا دیکارت سووڕایەوە لە سەر جێگەکەی و کەوت بەسەر لای ڕاستدا و لەوکاتەدا نوێژێکی کورت بەرز دەکاتەوە بۆ یەزدان، پاشان دەخەوێت و کت و پڕ ڕاستەوخۆ خەونی دووەم دەبینێت کە لەیەکەم ترسناکترە و بەلام لەو کورتترە. گوێی لە دەنگی هەورە گرمە دەبێت لە خەونەکەیدا، بەخەیالی خۆی وا دەزانێت هەر دوو چاوی کراوەتەوە و سەیری ژوورەکەی خۆی پێدەکات و دەبینێت وا ڕووناکیەکی بەهێز هەموو ناو ژوورەکەی ڕووناك کردووەتەوە، پاش ئەمە خەبەری دەبێتەوە و بیر دەکاتەوە لەم خەونە کەمێ دڵنیایی دێتەوە بەبەردا. پاشان سەر لەنوێ دەخەوێتەوە بۆ سێهەم جار خەون دەبینێتەوە بەلام خەونێکی ئاسودە بەمانای وشە پڕ لە ئاسوودەیی تەواو:

لەسەر مێزەکەی دوو کتێبی بینی یەکێکیان فەرهەنگێك بوو کە زۆر دڵی پێخۆش بوو تا ئەوپەڕی دڵخۆش کردن، ئەوی تریشیان کۆمەڵێك شیعری هەڵبژاردە بوو کە ڕاستەوخۆ دەستی کرد بە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی و سەری سوڕما بە یەکێك لە دێڕەکانی و زۆری بەلاوە مەبەست بوو بۆیە پاشانیش بڕیاری ئەوەی دا کە ئەو دێڕە شیعرە ببێتە دروشمی ژیانی لە داهاتوودا، ئەو دێڕە شیعرەش هی شاعیرێکی لاتینی بوو بەناوی (ئۆزونیۆس) کەتیایدا پرسیارە دەکات و دەڵێت: کام ڕێگا لە ژیاندا بگرمە بەر؟ هەروەها لەکاتی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا کەسێکی نەناسراو هات بۆ لای دیکارت و قەسیدەیەکی هەمان شاعیری پێشکەش کرد کە دەست پێدەکات بە وشەکانی بەڵێ یان نەخێر؟ کابرای نەناسراو لەبارەی جوانی قەسیدەکەوە بۆ دیکارت دووا، دیکارتیش وەلامی دایەوە بەوەی کە دەیناسێ و ئەو قەسیدەیە لە کتێبی شیعرە هەڵبژاردەکاندایە. لەو کاتەدا هەوڵی ئەوەی دەدا بگەڕێت بە دوای دۆزینەوەی ئەو قەسیدەیەدا لە کتێبەکەدا کەچی چاوی خشاند بەو ناوەدا

فەرهەنگەکە دیار نەمابوو. بەلام پاش ئەم ڕووداوە قامووسەکەی (فەرهەنگەکەی) دیتەوە بەلام شێوە و ناوەڕۆکی گۆڕابوو. دیکارت دەستی کرد بە کارکردن لەسەرهەڵدانەوەی ڕووپەڕی کتێبی شیعرە هەڵبژاردەکان و بەسەرسوڕمانەوە سەرنجی دەدایە ئەو وێنە جوانانەی وا کتێبەکەیان پێ ڕازێنرابوویەوە، پاشان کابرای نەناس و کتێبەکانیش نەمان و شاردرانەوە، دیکارتیش بە تەنها مایەوە لە خەونەکەیدا و لە ماوەی مانەوەکەیدا لە هەوڵی ئەوە دابوو تێبگات لەمانای ئەم خەوبینینەی. لەو بڕوایە دابوو کە فەرهەنگەکە نیشانە (ڕەمزێك) بووە بۆ هەموو زانستەکان لە یەکێتیدا، شیعرە هەڵبژاردەکانیش ڕەمزێك بووە بۆ یەکێتی و یەکگرتنی فەلسەفە بەهۆی ژیری و داناییەوە. بەلام لەماوەی خەوەکەیدا ئەوەی دووپارە نەکردەوە لە بڕوای خۆیدا کە ئیلهامی شاعیران سەرچاوەی ژیری و حیکمەت بێت و سەرکەوێت بەسەر بیرکردنەوەی فەیلەسووفەکاندا.

پاشان دیکارت لە خەوەکەی هەڵسا و دڵنیایی لا دروست بووبوو بۆ خەونی سێهەمی و لەو بڕوایە دابوو کە ڕۆحی یەزدان ویستوویەتی گە نجینەکانی زانست و حیکمەتی بۆ دەربخات و لەگەڵ ئەوەشدا دوو خەونەکەی پێشووتری وەکو ئاگادارکردنەوەیەکی کۆتایی وا بووە بۆ ئەو دژی هەموو تەمەنی ڕابردووی تا ڕۆژی ئەمڕۆ.

هەرچەندە مێژوونووسان چەند بۆچوونێکی جیاوازیان هەیە لە لێکدانەوەی گشتی بۆ ئەم خەونانە، تەنانەت هەندێکیان پەنا دەبەنە بەر فرۆید خۆی کە بەشێوەیەك ئەویش لەتوانایدا نەبووە لێکدانەوەیەکی دیاریکراو بدات بە دەستەوە بەتەواوی ئەویش لەبەر ئەوەی کە دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی مادام خەونەکە هی کەسێکە لە ژیاندا نەماوە لە بەر ئەوە ناتوانێت

لیکدانەوەیەکی بن بەست بکات بۆ خەونەکان. تەنها ئەوە بەسە گەر سەرنج بدەینە خەونەکەی یەکەم جاری کە تەعبیر لە ڕاڕایی و سەرسوڕمانی دیکارت دەکات لە نێوان بیر و بۆچوون و ئاڕاستە جیاوازەکاندا وا ژیانی داگیر کردبوو لە ڕابردوودا و خوازیاری ڕزگاربوونە لێی ئێستا و ئاییندەش هیچ شتێکی لە بارەوە نازانێت. پاشان ئەو تیشکی ڕووناکیەی لەکۆتایی خەونی دووەمدا دەبینرێت ئاماژەیە بۆ خاڵی وەرچەرخان لە ژیانی دیکارتدا و ڕەمزێکە بۆ ئیرادەی کۆتایی بۆ ئەو ڕزگار بوون لە ڕابردووی و پێشکەوتن و بە پیرەوەچوونی ئاییندەیەکی کامڵ و پێگەیشتووی پڕ لە پیت و فەڕ. پاشان خەونی سێهەم دێت کە نوێنەرایەتی فەلسەفەیەکی یەکگرتووی باڵا دەکات کە دیکارت بیری لێ دەکاتەوە هەر لەو کاتەوەی وا گەیشتووە بە ( بیسکمان )، بەڵکو هەر لەوانەیە لەو کاتەشەوە بیری لێ کردبێتەوە بە بیرکردنەوەیەکی تەم و مژاوی لە ساڵانی کۆتایی خوێندنەکەیدا لە قوتابخانەی ( لافلیش ).

هەروەها ( باییە )ی مێژوو نووسی دیکارت وای تۆمار کردووە کە دیکارتی فەیلەسوف لەو شەوەدا خەونەکانی تێدا بینیوە توانیویەتی بنەماکانی زانستێکی سەرسوڕهێنەر بدۆزێتەوە،( ١٢ ) بەڵام لێکۆڵینەوە مێژووییەکان ئەوە دەرناخەن کەدیکارت لەو کاتەدا بەمە هەستابێت یان کەمێك پاش ئەو کاتەش ئەمەی کردبێت، دۆزینەوەیەکی زانستی دیاریکراوی ئەنجام دابێت، یان سەرقاڵی دامەزراندنی فەلسەفەیەکی کامڵ بووبێت. ئەوەش سەلمێنراوە کە دیکارت لەو شەوە بە ناوبانگە دا سەرەتاکانی ئەندازەی جیاکاری و تەواوکاری نەدۆزیوەتەوە، هەروەها دوای ئەویش ڕاستەوخۆ دەستی نەکردووە بەنوسینی کتێبی ڕێزمانێك بۆ ئاراستەکردنی عەقڵ.

بەڵام لێرەدا دوو حاڵەت هەیە كە دەكرێت تەئكیدیان لەسەر بكەینەوە لە ڕووی مێژووییەوە: یەكەمیان ئەوەیە دەستنووسەكانی دیكارت لەو كاتەدا بەڵگەی ئەوە نیشان دەدەن كە دیكارت لەنێوان دوو هەڵوێستی عەقڵیدا بووە، هەڵوێستێكیان بریتییە لە هەڵوێستی ئەندازەی میكانیكی كە ئەمەشی لە دوای (بیكمان) وەرگرت و دەستی كرد بە پەرەپێدان و جێبەجێكردنی پاش چەند ساڵێك بۆ ئەوەی وەك بیر و باوەڕێكی ئالی گشت گیری بكات بۆ ڕاڤە لێوەرگرتنێكی بیركاریانەی كامڵ لە سروشتدا. پاشان هەڵوێستەكەی تریان زۆر بە تەواوی ڕوون و ئاشكرا نیە چونكە تێیدا ئاماژە بۆ یەكێتی و یەكگرتوویی سروشت دەكات و هەروەها بۆ ئەو خۆشەویستی و پەیوەندییەی وا بەهۆیانەوە بەشەكانی سرووشت پێكەوە گرێ دەدرێن و ئاوێزانی یەكتر دەبن.

دیكارت بە شێوەیەك ئەم هەڵوێستەی دواییانی تێپەڕاندووە و دەستبەرداری بووە تەنانەت ئێمەش هیچ كارتێكردنێكمان لەسەری بۆ نادۆزرێتەوە لە دەستنووسەكانیدا پاش ئەو هەڵوێستەی یان لە نووسین و دانراوەكانی تریشیدا بەدی ناكەین.(١٣)

حاڵەتی دووەمیان كە دەكرێ تەئكیدی لەسەر بكەینەوە ئەویش بریتیە لەو بڕیاردان و پێداگیریە ڕاستگۆییانەیەی دیكارت كە دابووی لەسەر تەرخانكردنی ژیانی خۆی بۆ بیركردنەوە، ئەمەش بەبەڵگەی دابڕانی خۆی لە پیشە سەربازیەكەیدا دەردەكەوێت، پاش ئەمەش ئەو پلەو پایە قەزائیەی ڕەت كردەوە كە بەهۆیەوە خۆی پێناساند لەنێو خەڵكیدا لەو كاتەی وا سەربەخۆیی تەواوی بەدەست هێنابوو لە لایەن خێزانەكەیەوە و بەسەربەخۆبوونێكی ماڵی و دارایی كامڵ لەساڵی ١٦٣٢ دا، وە پەیمانی دا بە پێیان بچێ بۆ حەج و زیارەت هەتا دەگاتە دێری (پاكیزە)ی لوریت لە

ئیتالیا، ئەم حەج کردنەی هەر لە منداڵیەوە بیستبوو لەو کاتەوەی وا قوتابی بوو لە قوتابخانەی ( لافلیش )ی سەرەتایی و بۆیە نەزری کرد لەسەر شانی خۆی بۆ ( پاکیزە ) دوای شەوی ١٠ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٦١٩.

## دیکارت و چوونە کۆلێژ بۆ بەدەست هێنانی زانست و زانیاری:

مێژوو ڕادەوەستێت بە ڕووی دیکارتدا و دەبینین چۆن ئەو ماوەیەی لێ بەسەر دەچێت لەنێوان ساڵانی ١٦١٩ تا ١٦٢٢ بە بێدەنگی لەسەر شێوەیەکی وردەکار، لەکاتێکدا گەر سەرنج بدەینە ئەو ساڵەی کۆتایی دەبینین وا دیکارت خۆی دەبینێتەوە لە فەرەنسا بەتەنیشت ئەندامانی خێزانەکەیەوە تا بگات بەو بەشە میراتیەی کەلە پاش دایکی بەجێماوە. بەڵام وەکو زانراوە دیکارت هەڵسا بە گەشتێکی دوور و درێژ لە باشووری ڕۆژئاوای ئەڵمانیاوە بۆ باکووری ئەو وڵاتە ئەمەش لەکۆتایی ساڵی ١٦١٩ دابوو، لەوێشەوە بەدەریا دا پەڕیەوە بۆ هۆڵەندا و ماوەیەکی کەم لەوێ مایەوە. پاشان بەدەریا دا پەڕیەوە لە هۆڵەنداوە بۆ فەرەنسا لە گەشتێکدا کەناتوانرێت بە وردی کات و ساڵەکەی دیار بکرێت.

بەڵکو ئەوە دەوترێت کە لەم گەشتەیدا ئەو دەریاوانەی وا ئەم سواری کەشتیەکەی بووە وستوویانە خۆی و شاگردەکەی ( خزمەتکارەکەی ) دیکارت بکوژن و هەرچی هەیە لە کەل و پەل و شتی بەنرخ بیبەن لەگەڵ خۆیاندا. بەلام دیکارت زانیویەتی بەنیەت و مەبەستەکەیان و ئەوانەشی وا لەگەڵیاندان، بۆیە ئەمیش هەستاوە بە دەرهێنان و پیشاندانی شمشێرەکەی بەوانەی وا دەیانویست هێرشی بکەنە سەر لەکەشتیەکە دا کەژمارەیان کەمتر

نەبووە لە بیست کەس، ئەم بەتەنها خۆی هەڕەشەی لێکردوون و چاوترسێنی کردون بەشێوەیەك هیچ کەسێکیان نەتوانێت زاتی ئەوە بکات هێرش بکاتە سەری. هەموویانی زارەترەك کردبوو لە بەر ئەوە وازیان لیٚهێنا و ئەمیش بۆ خۆی گەشتەکەی تەواو کرد و لەکەشتیەکە دابەزی کاتێ گەیشتە ( دنکرك ).

لەتوانامان‌دا نیە زۆر بە وردی تەئکید لەسەر ئەو گەشتەی بکەینەوە کە بۆ ئیتالیا ئەنجامی داوە، ئەوەش نازانین ئایا ئەو حەجەی ئەنجام داوە کە بچێت بۆ ( لوریت ) یان نا.

هەر هەموو ئەو شتانەی کە لە بارەی ژیانیەوە دەزانرێت لە نێوان کۆتایی ساڵی ١٦٢٢ و ساڵی ١٦٢٥ دا تەنها ئەوەندەیە کە بە فیعلی سەفەری کردووە بۆ ئیتالیا و هیچی‌تر، پاشان گەڕاوەتەوە لیٚ و ڕازی نەبووە لەو گەشتەی بۆ ئەو وڵاتە. پاشان لەساڵی ١٦٢٥ دا لە فەرەنسا ژیاوە لەنێوان پاریس و لادیٚ دا نزیکەی سیٚ ساڵ و لەو ماوەیەشدا ئاشنایەتی پەیدا دەکات لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر لە زانایان و پیاوانی ئایینی، لەناو هەموویاندا بەتایبەتی ئەو نامەبەر و هاوڕێیەی کە دادەنرێت بەیەکەمین خۆشەویستی دیکارت ئەویش ( مرسین )ە کە بۆ ماوەی بیست ساڵ وەك ناوەندێکی پێناسین و ئاڵوگۆڕی نامە و هاتووچۆ بوو لەنێوان خۆی و زانایان و فەیلەسوفان و لاهوتیەکانی ئەوروپادا.

وە لەماوەی هەستانی بەم کارەیەوە پەیوەندی کرد بە زانایانی سروشت ناس و ئەندازیاران و ئەو پیاوانەی وا گرنگیان دەدایە جیٚبەجیٚ کردنی زانست و بیرکاری لە پیشەسازیدا، لەناو ئەوانەشدا یەکێکیان ئەو هاوڕێیەی بوو کەناوی ( فرییە ) بوو ئەوەی وا دیکارت پەیمانی پیٚدا کە هەر چیەکی پێویست بێت بۆی دروست بکات لە ئامێرەکان بۆ توێژینەوە زانستی و تیشکاوەریەکانی بەجۆرێکی ناوازە و تایبەت.

گرنگترین ڕووداوەکانی ژیانی لەو ماوەیەدا بریتی بوو لەو کۆبوونەوەیەی کەلە پاییزی ساڵی ١٦٢٧ دا ئەنجام درا و کۆتایی پێهات لە لایەن قاصدێکی ڕەوانەکراوەوە لە پاریس، کەتێیدا هەر یەکە لەدیکارت و (کردینال دی بیرۆل)ی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئۆراتواری ئایینی و جگە لەم دووانەش گەورە پیاوانی زانا و بیریاران (مفکرین)ێکی زۆر ئامادە بووبوون، گوێیان گرتبوو بۆ لێدوانەکانی پیاوێك بەناوی (دیشاندۆ)وە کە لەبارەی بنەماکانی زانستەوە قسەی دەکرد ئەو زانستەی کەوا پێویست بوو بەتێگەیشتن و چەمکەکانی خۆی جێگای ئەو زانستەی قوتابخانە بگرێتەوە. بەڵام ئامادەبووان قەناعەتیان نەبوو بەقسەکانی کەهەمووی بریتی بوو لە کۆمەڵێك تەم و مژ و داواکاری سەیر و سەمەرەی دوور لە زانست بەهەموو مانایەکی دووری. بۆیە لێرەدا (کردینال دیبیرۆل) داوا لە دیکارت دەکات کە ڕەئی خۆی لەبارەی ئەو بابەتەوە دەربڕێت، ئەویش بەخۆپارێزیەکی توونددەوە وەڵامی دایەوە بەسەرەتا و دەستپێکردنێکی ڕەخنەئامێز و ڕەتکردنەوەی بانگەشەکانی (دیشاندۆ). پاشان بەکورتی ئاماژەی کرد بۆ چەند بیر و ڕایەکیتر لەوانەی بریکارێتی زانست دەگرنە ئەستۆی خۆیان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و پێشکەوتن و پیت و فەڕەکانی لە لایەکەوە و هەروەها شکۆداری و گەورەیی ئایینیش لە لایەکیترەوە.

کاتێك (کردینالْ دیبیرۆل) نرخی ئەو بیروڕایانەی زانی کە دیکارت وەك بەڵگەهێنانیەوە، داوای لێ کرد کەسەردانی بکات، هەروەها پرسیاری ئەوەی لێ کرد تا بیر و باوەڕەکانی خۆی بۆ واڵا بکات یان هیچ نەبێت جارێکیتر ئەم کارەی بۆ بکات، تا لەسەر ئەو تێزە خۆی تەرخان بکات بۆ چاکردنی فەلسەفە و بەکاری بێنێت لەسەرخستن و پشتگیری کردنی ئەو ڕاستیە میتافیزیکیە

گەورانەی وا یەك دەگرنەوە لەگەڵ بیر و باوەڕی کاتۆلیکیدا ئەو بیر و باوەڕەی کەخواوەند پێی خۆشە لە هێزی عەقڵ و دانایی و جێبەجێکردنی زیرەکی و کارامەیی.

لەدانپیانانەکانی دیکارتدا لەسەر ئەم بابەتە بۆمان تۆمار نەکراوە بەڵکو زۆربەی ئەوە دەردەکەوێت دیکارت لەکاتی بەرپەرچ دانەوەکەیدا بۆ ( دیشاندۆ ) هیچ تیۆریەکی میتافیزیکی نوێی ئاشکرا نەکردووە، بەڵکو بەو قسەیە کۆتایی پێهێناوە کە خوازیار و بەهیوایە هەستێ بە زانستی سروشتناسی میکانیکی گشتی و تێیدا بەڵگەی بیرکاریەکان بەکار بێنێت لە هەموو ڕووەکانیەوە. بەدڵنیاییەوە ئەوە دەردەکەوێت کە پاش ئەم کۆبوونەوەیە دیکارت بۆ چەند جارێك سەردانی ( کردینال )ی کردووە و لەبارەی بیر و ڕا و پرۆژە زانستیەکانی خۆیەوە بۆی دواوە. بگرە لەوانەشە پەیمانی دابێت بە ( کردینال ) لەم پرۆژانە دا لەگەڵیا بڕوات هەتا دەگاتە کۆتایی هاتن و تەواو بوونیان، پاش ئەمەش دەگوازێتەوە بۆ لێدوان لەبارەی فەلسەفەوە ئەو فەلسەفەیەی وا سەربەخۆیی زانست دەپارێزێت و دان دەنێت بە بوونی خواوەند و شوێنگە و هێز و تواناکانی ئەو خواوەندە.( ١٤ )

لەساڵی ١٦٢٨ دا دیکارت بڕیاری گۆشەگیری و خەڵوەتنشینی خۆیدا و بە شێوەیەکی کۆتایی وازی هێنا لە ژیانی کۆمەڵایەتی. فەرەنسای بەجێهێشت و هاوڕێکانی ڕاسپارد تا بگەڕێن بەدوای دۆزینەوەی ماڵێکدا بۆی لەیەکێ لەگوندەکانی هۆڵەندا. کاتێك ئەمەی بۆ ئەنجام درا ئیتر سەفەری کرد بۆ هۆڵەندا و ژیانی تێدا بەسەر برد بە تەنهایی و دوور لە خەڵکی تا نزیك بوو نەوەی لەکۆتایی ژیانی بەم جۆرە مایەوە.

تەنها هەر لەشارێکدا نەمایەوە لە هۆڵەندا یان هەر لەماڵێکدا بەڵکو هەر ماوەیەك لەشارێك دەبوو پاشان دەیگواستەوە بۆ شارێکیتر و ماڵێکیتر و لەو شارەدا و دوور لەو شاردی تر کەوا بەجێی دەهێشت بۆ ئەوەی کەس نەیناسێت و پەیوەندی پێوە نەکەن و کەسیش نەناسێت و پەیوەندی نەکات بەهیچ کەسێکەوە، تەنانەت ناونیشانی خۆی تەنها دابوو بە ( مرسین )ی هاوڕێی و پێی وتبوو کاتێ وتارەکانی خۆی بۆ دەنێرێت با نەیهێنێت بۆ ماڵەکەی خۆی بەڵکو لە ماڵی کەسێکیتر دابنێت ئەو کاتە دیکارت خۆی لەوێ یەك بەدوای یەکدا وەریان دەگرێت. هەروەها دیکارت گوندی بەلاوە باشتر بوو لە شار بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ماڵەکەی لەگوندێکی نزیکی شارێك لەشارەکاندا بوو بۆ ئەوەی بتوانێت پێداویستیەکانی ماڵەوەی لەوێ بکرێت یان بۆ پڕۆژە زانستیەکانی.

دیکارت لەساڵی ١٦٢٦ دا لە هۆڵەندا نیشتەجێ بوو لەشاری ( فرینکر ) پاش چەند گەشتێکی لە نێوان هۆڵەندا و فەرەنسا، لەماڵێکی نزیك لە دەروازەی شارەوە نیشتەجێ بوو هەتا دوور نەبێت لە لادێ. پاشان دامەزرا لە زانکۆکەیدا و وانەکانی سروشتناسی دەخوێند بە تایبەتی وانەکانی زانایەتی تایبە تمەندی بواری مایکرۆسکۆب ( گەردیلەبین ). پاشان لە کۆتایی ئەو ساڵەدا ( فرینکر )ی بەجێهێشت و ڕووی کردە ( ئەمستردام ) و دەیگواستەوە بۆ ماڵێکیتر لەشارەکە دا و هەڵدەسا بە گەڕان و گەشت کردنی کورت و دوور و درێژ بۆ هەندێ لەشارەکانی هۆڵەندا.

وای لێدەگێڕنەوە لەساڵی ١٦٣١ دا دامەزراوە لە زانکۆی ( لیدن ) و پەیوەندی کردووە بە ڕۆژهەڵتناس و بیرکاری زان ( جۆلیۆس )ەوە و هەندێ مەسائیلی ئەندازەیی خستۆتە بەردەمی و پێشانی داوە کە لەئەندازیارانیتر

لەمەوپێش نەیانتوانیوە بۆی حەل كەن، لەكاتی حەل كردنیدا دیكارت مـژدە دەداتە ( جۆلیۆس ) بۆ دۆزینەوەی سەرەتاكانی ئەندازەی شیكردنەوە.

هەروەها دیكارت لە رێگەی ( جۆلیۆس )ەوە ( قستنتین هۆیگنز ) دەناسێت كە باوكی زانای تیشكاوەری بەناوبانگ ( كریستیان هۆیگنزە ) كە لەو كاتەدا باوكی سەرقاڵی پلە و پایەیەكی گرنگ بوو لە كۆشكی شاهانەی هۆڵەندیدا ئەمە سەرباری ئەوەی كە زانایەكی ناودار بوو لەبواری سروشتناسی و بیركاریدا و لەگەڵ ئەوەشدا شەیدای هونەر و ئەدەب و مۆسیقاش بوو.

دیكارت لەساڵی ١٦٣٣ دا بۆ ماوەیەك لەشاری ( دیفنتر ) نیشتەجێ بوو لەوكاتەدا پەیوەندی كرد بە ( هێلین هانس )ەوە كە دەگونجێ لەو كاتەدا ئەم ئافرەتە خزمەتی دیكارتی كردبێت بۆیە دەیخوازێت و كچێكی لێ دەبێت ناوی دەنێت ( فرانسین ) ئەمەش وەكو وەفاداریەك بۆ یادی وڵات و نیشتمانەكەی. دیكارت ئاماژەی بۆ ئەو پەیوەندیە كردووە تەنها بەدەگمەن نەبێت وەكو لەو كاتانەدا كە ئامادە ئەبوو لای كچەكەیدا یان ئەو كاتەی خەریكی ئامادەكردنی دایەن ( شیردەر ) بوو بۆی. زۆر گرنگی نەدەدایە ( هێلین )، بەڵام كچەكەی زۆر خۆش دەویست بە خۆشویستنێكی لەرادەبەدەر، كەچی كچەكەشی نەما و كۆچی دوایی كرد لەتەمەنی پێنج ساڵیدا ئەو سا دیكارت زۆر غەمگین و ناڕەحەت بوو بەم كارەساتە و تائەوپەڕی بێتاقەتی خەم و خەفەتی دەخوارد.

لەكۆتایی ساڵی ١٦٣٣ەوە بۆ ساڵی ١٦٣٥ دیكارت لە ( ئەمستردام ) جێگیر بوو هەروەها لەچەند ماڵێكدا بۆ خۆی نیشتەجێ دەبوو لەو شارەدا و ژیانی دەگوزەراند هەر ماوەیەك لە خانوویەكدا جیا لەوەی پێشووی. پاشان هەر لەوماوەیەدا سەفەری كرد بۆ ( دانیمارك ) بەگشتێكی كورت. لەكۆتایی ساڵی ١٦٣٥ دا لەشاری ( باوترخت ) لەباكووری هۆڵەندا مایەوە و نیشتەجێ بوو.

لەساڵی ١٦٣٦ دا گەڕایەوە بۆ (ئەمستردام) و خۆی تەرخان کرد لەسەر کۆتایی پێهێنانی کتێبە زانستیەکانی و باسەکەی لەبارەی میتۆدەوە، لەسەرەتای ساڵی ١٦٣٧ دا ڕاستەوخۆ دەستی کرد بەچاپ کردنی کتێبەکانی.

هەروەها ئەوەش وتراوە لەبارەیەوە کە ئیشی کردووە لەو کتێبەیدا بەناوی (شکانەوەی ڕووناکی) هەر لەساڵی ١٦٢٩وە، کە لەوانەیەلەساڵی ١٦٣٢ دا لێ بوویێتەوە لە نووسینی ڕەش نووسی ئەوکتێبە. پاشان مەسائیلەکانی ئەندازەی ئیغریقی دەخاتە پێش چاو بۆ توێژینەوە لەکۆتایی ساڵی ١٦٣١دا، هەروەها لەسەرەتاکانی ساڵی ١٦٣٢ دا کۆتایی دێنێت بە دۆزینەوە لەبواری ئەندازەی شیکردنەوەدا. هەروەها هەر لەم ساڵەدا دەست دەکات بە نووسینی کتێبێکی کامڵ وتەواو لەسەر *"جیهان"* لێکۆڵینەوەی تێدا کراوە لەبارەی ڕەهەندەکانی درێژبوونەوە (کشان) و جووڵە، لەگەڵ دیاردەکانی ڕووناکی بەشێوەیەکی گشتی. وە لەساڵی ١٦١٣ دا دەبێت گرنگی دەدات بە توێکاری، لەساڵی ١٦٣٣ دا دەست دەکات بە نووسینی بەشی دووەمی کتێبەکەی پێشووی "کتێبی ئینسان". هەر لەوانەیە لەو ساڵە دا واتە لەساڵی ١٦٣٣ دا لێبوویێتەوە لە نووسینی ئەو کتێبە ئەوەش لەکاتێکدا دەبێت کە هەواڵی ئیدانەکردنی کەنیسەی کاتۆلیکی دەبیسێت وا بەرامبەر بەگالیلۆ ئەنجام دراوە سەبارەت بەوەی کە لە ڕا پۆرتەکەیدا وتویەتی زەوی دەسوڕێتەوە. وا دەگونجێت ئەمیش گەیشتووەتە هەمان ئەنجام لەکتێبەکەی پێشوویدا. لەکاتێکدا ئەو هەواڵی ئیدانە کردنە دەبیسێت تەنانەت بۆ هاوڕێکانی ئاشکرای دەکات کە ئەم خۆی زۆر پێداگیری دەکات لەسەر قەدەغەکردن و بڵاونەبوونەوەی کتێبەکەی "جیهان" ئەمەش لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی: یەکەمیان حەزی لە پشت گیری کردن و هاندانە و ئارەزووی لە دوور کەوتنەوەیە بەرامبەر بە ناڕەزایی و ڕەخنە لێگرتن و تیر و

توانج، دووەمیان وای دادەنێت ئەوە مەسەلەیەکی زانستی لەمەو پێشەو هەموو مەسەلە زانستیەکانیش جگە لەوەی بەرهەمی گریمانە و بەڵگەهێنانەوەی گریمانکاری نەبێت هیچیتر نین، پاشان دوای ئەمە دەستی دایە ئیش کردن لەسەر تەواوکردنی توێژینەوە زانستیەکانیتری و بڵاوکردنەوەیان: سەرەڕای کتێبەکەی "شکانەوەی ڕووناکی" دیاردەکانی کەش و هەوای دەخوێند. لە کارە بەرز و بەنرخەکانیدا هەستا بە نووسینی کتێبێك کەلە ساڵی ١٦٣٧ دا دەرچوو لەگەڵ کتێبێکیتردا بەناوی "ئەندازە" و هەروەها لەگەڵ کتێبی "شکانەوەی ڕووناکی"وە لەگەڵ دەرچوونی ئەم سێ بابەتە وتارە زانستیانەدا هەستا بە دەرکردنی پێشەکیەك لەبارەی مێژووی بیر و بۆچوونی خۆیەوە و لەبارەی مەنهەجەکەیەوە، ئەو پێشەکیەش ئەوەیە کە ناسراوە بە *"وتارێك دەربارەی میتۆد"*.

دیکارت ئەو نامانەی پێدەگەیشت کە لەلایەن ئەو زانایانەوە بۆی دەهاتن وا هەندێکیان دەناسی و هەندێکیانی نەدەناسی ئەویش لەبارەی ناوەڕۆکی نووسینەکانی پێشوویەوەیە و ئەمەش لە بیروبۆچوونە زانستیە نوێیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. هەروەها چەند وتارێکیتری پێدەگات لەبارەی ناوەڕۆکی لاپەڕەکانی "وتراوەکان لە بارەی پرۆگرامەوە" کە لەبارەی تیۆریە فەلسەفیەکانەوەیە.

بەدڵنیاییەوە دیکارت سەرکەوتنی خۆی بەدەست هێنابوو لەئەنجامی سەرسوڕمانی هاوڕێکانی و ڕازی بوونی خۆی لەمەسەلە زانستیەکان. هەروەها ئەو نامە یەك لەدوای یەکانەی وای پێی دەگەیشتن بەکۆمەڵ هەموویان هاندەر بوون بۆی لەسەر پێداگیری و مانەوەی لەتوێژینەوە و بیروبۆچوونە فەلسەفیەکانی (بیرکردنەوە فەلسەفیەکانی). بۆیە بڕیاریدا لەنێوان ساڵانی

١٦٤٨ و ١٦٣٩ دا خۆی تەرخان کات بۆ فەلسەفە بەخۆ تەرخانکردنێکی کامڵ وتەواو. هەر لەبەر ئەمەشە دەبینین لەساڵی ١٦٣٨دا خۆی گۆشەگیر دەکات لەشاری (سان بۆرت)ی باکووری هۆڵەندا بەشێوەیەك هیچ کەس ناتوانێت پەیوەندی پێوە بکات تەنها کەسە زۆر نزیکەکان نەبێت لەوانەی وا زۆر پەیوەندیان لەگەڵیا توووند و تۆڵ بووە. لەو دابڕان و تەنهاییە دا نزیکەی دوو ساڵ مایەوە و لەو ماوەیەشدا چەند گەشتێکی کورتی کردووە بۆ (ئەمستردام) و (ئۆتەرخت).

لە سێپتەمبەری ساڵی ١٦٤٠ دا بەشێوەیەکی زۆر بە پەلە و خێرا ناردیان بە شوێنیا تا بێت بە دەم ئەو نەخۆشیەوە کە کچەکەی تووشی بووە واتە (فرانسین) بەلام بەداخەوە نەیتوانی ئامادە بێت تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەواڵی مردنی کچەکەی زانی. بۆیە ساڵی ١٦٤٠ تاڵترین ڕۆژگارەکانی ژیانی بوو کەبەدڵتەنگی و پەژارەوە بەسەری دەبرد، چونکە هەر لەو ساڵەدا لە پاش مردنی باوکی مەرگی کچەکەشی بینی.

لەساڵی ١٦٤١دا لێبوویەوە لەنووسینی بابەتێکی فەلسەفی و کۆی مەبەستەکەی لە ڕێگەی (مرسین)ی هاوڕێیەوە نارد بۆ هەندێ لە فەیلەسووفە گەورەکان و پیاوانی ئایینی، ئەو پرسیار ونارەزاییانەی پێگەیشتەوە کە لە لایەن هەندێکیانەوە ئاراستەی کرابوو. وە ئیشی بۆ ئەوە دەکرد تا بلاویان بکاتەوە لەکۆتایی ئەم نووسینەیدا لەگەڵ وەلام دانەوەکانی خۆیدا بۆ ئەو ڕەخنە و نارەزاییانەی کە لێی گیرابوو. کتێبەکە لەساڵی ١٦٤٤ دا دەرچوو بەناوی "تێڕامان لە یەکەمین فەلسەفە" کە تێیدا بوونی خوا دەسەلمێنێت لەگەڵ ئەو جیاکردنەوە هەست پێکراوەی کە هەیە لە نێوان دەروون و لاشەدا، ئەمە و سەرباری زیادکردنی ئەو نارەزاییانە و وەلامدانەوەکانیان.

پاش ئەوەی دیکارت کتێبەکەی "ڕامانەکان"ی بلاو کردوە بیری کردەوە لەدانانی کتێبێکی نوێ کە تێیدا فەلسەفەکەی خۆی بۆ قوتابخانەکان دەخاتە پێش چاو بەو هیوایەی ئەو فەلسەفەیە بلاو بێتەوە نەك تەنها هەر لە ناو زانایاندا بەڵکو لەناو قوتابیانیشدا دووبارە بلاو بێتەوە، بەتایبەتی لەنێوان قوتابیانی قوتابخانەکانی یەسوعیەکان، مامۆستا پێشینەکانی، بەلام هیچ پشتگیری و هاندانێکی لێ بەدی نەکردن.

کتێبەکەش لەساڵی ١٦٤٤ دا دەرکەوت و چاپ کرا بەناوی *"بنەماکانی فەلسەفە"*.

ئەوەی دەردەکەوێت ئەوەیە کە کتێب و نووسینەکانی دیکارت و پەیوەندیە فەلسەفیەکان لەگەڵ هاوچەرخیەکانی خۆیدا و بەتایبەتی یەسوعیەکان و هۆڵەندیەکان، کاریگەر بووە بۆ ماوەی چەند ساڵێك بە موجادەلە و موناقەشەکردن و نەگەیشتۆتە کۆتایی بۆ ئەنجامێك لە نێوان خۆی و لەنێوان یەسوعیەکاندا، زانایانی لاهوت لە هۆڵەندا و مامۆستایانی زانکۆکان هێرشیان کردۆتە سەر بەتایبەتی زانکۆی (ئۆتەرخت) بەگژ بیر و ڕاکانیدا دەچوونەوە بە قوتابیان و زانایان و فەیلەسوفەکانیەوە، پاشان بوونە ڕێگر و کۆسپ لە ژیانی تایبەتیدا و دژایەتیان دەکرد، بۆ ماوەی چەند ساڵێك دیکارت بە پاکژی مایەوە و بانگەشەکانی دوژمنانی بەدرۆ خستەوە و بەرپەرچی ڕەخنەکانی دەدانەوە و پارێزگاری لەخۆی دەکرد پاش ئەوەی هەر هێرشێکی تازەیان دەکردە سەر، لە هەمان کاتیشدا بەرگری دەکرد لە ئازادی فیکرو بلاوکردنەوە و فێرکردن. بەلام دوژمنەکانی تەنها بۆ ساتێك نەیان دەهێشت هێدی و ئارام بێت تا لە دواجار و کۆتایی ئەو بارە ناهەموارە دا ناچاریان کرد پەنا بەرێت بۆ هاوڕێکەی (هویگنز) کە یەکێك بوو لە پیاوانی کۆشکی

**شاهانەی هۆڵەندی و پاشانیش پەنای برد بۆ خودی سەفیری فەرەنسا لەو شانشینەدا.**

**زۆر لە تەنگژە و ناخۆشی ژیاندا دەژیا لە هۆڵەندا بێتوو گەر هاوڕێیەتی شاژنە (ئەلیصابات) و وتارەکانی نەبووایە لە زۆر بواردا بەتایبەتی لەو بابەتانەی وەك بابەتی (ئەخلاقیات)، لە دەوروبەری ساڵی ١٦٤٥ دابوو دیکارت دەستی کرد بە چارەسەرکردنی مەسەلە مرۆڤایەتیەکان بەشێوەیەکی گشتی و (ئەخلاقیات) بەشێوەیەکی تایبەت. کە تێیدا وتارەکانی دەنووسی یەك بەدوای یەکدا بۆ شاژنە (ئەلیصابات) و وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە و ئاڕاستەی دەکردە بیر و بۆچوونەکان و ژیانی. لەساڵی ١٦٤٩ دا یان ساڵێك پێش مردنی کتێبێکی دەرکرد بەناوی "*کاردانەوەکانی دەروون*".**

**دیکارت سێ جار سەفەری کردووە بۆ فەرەنسا لەو ماوەیەی کە لەهۆڵەندا نیشتەجێ بوو پێش مردنەکەی. جاری یەکەم لەساڵی ١٦٤٤ دابوو کە خۆی تەرخان کرد لەسەر پیاچوونەوەی وەرگێڕانە لاتینییەکەی بۆ "*وتارێك دەربارەی میتۆد*". پاشان بۆ جاری دووەم گەڕایەوە لەساڵی ١٦٤٧ و چاوی کەوت بە (باسکاڵ) و کەوتە گفت و گۆ لەگەڵیا لەبارەی بابەتی بۆشاییەوە(فضاء). لەساڵی ١٦٤٨ دا گەڕایەوە بۆ پاریس لە سەر داخوازی و بانگهێشتی تایبەتی لە لایەن هەڤاڵەکانی و حکومەتی فەرەنساوە، لەو کاتەدا وڵاتی بینیەوە لە شۆڕشێکی جەماوەریدا بوو کە هەڤاڵەکانی سەرقاڵ بوون پێوەی. لە بەر ئەوە گەڕایەوە بۆ هۆڵەندا بە نائومێدی و هیوابڕاوی.**

**دیکارت لەماوەی سەردانەکانیدا بۆ فەرەنسا (شانو)ی ناسی، کە ئەو کەسە بوو لە پاشاندا دەست نیشانکرا وەك سەفیرێك لە لایەن شاژنە (کریستینا) وە شاژنی سوید، کە هەر ئەمیش بوو بوویە ناوەندێك بۆ یەکتر ناسین لە نێوان**

شاژن و دیکارتدا. دیکارت نامەی دەنووسی بۆ شاژن لە بارەی مەسەلە ئەخلاقیەکانەوە. وەڵامی ئەو بانگهێشتەی شاژنی دایەوە کە داوای لێکردبوو سەردانی سوید بکات و ئەمیش ڕەزامەندی خۆی لە سەر دەربڕی، تا بڕوات بۆ لای و لەوێ ببێتە راوێژکاری شاژنی سوید و لەهەمان کاتیشدا وەك مامۆستایەك بێت بەسەریەوە لەبوارەکانی زانست و فەلسەفەدا، ماوەیەکی زۆری خایاند ئەم وەڵامدانەوە و چوون و نەچوونەی دیکارت بۆ سوید بەڵام لە ئاکامدا نەیتوانی ڕەدی کاتەوە و هەر چۆنێك نەبوو داواکەی جێبەجێ کرد و ڕۆیشت بۆ سوید.

لە پایزی ساڵی ١٦٤٩ دا گەیشتە سوید، هەستی بە سەرما و سۆڵەیەکی زۆر کرد لەوێ. پێویست بوو لەسەری بەیانیان زوو دەرچێت بۆ وتنەوەی دەرسەکانی بە شاژن، کە ئەمەش بەلایەوە زۆر ناخۆش بوو چونکە ئەم بەدرێژایی ژیانی لەسەر ئەم شێوازە ڕانەهاتبوو. بۆیە لەمانگی یەنایەری ساڵی ١٦٥٠ داتووشی نەخۆشیەکی کوشندەی سیەکانی بوو، ناچاری کرد بۆ ماوەی چەند رۆژێك لەسەر جێگا بۆی بکەوێت و بمێنێتەوە، بەڵام لەو ماوەیەشدا هیچ ئافاقەیەکی بۆ نەهات لە ڕووی نەخۆشیەکەوە تەنها ئەوەندە نەبێت کە دەیزانی ئیتر نزیك بۆتەوە لە کۆتایی ژیانی و بەرەو مەرگ هەنگاو دەنێت.

زۆر بەبێدەنگی و هێمنی دیکارت ئەو کاتانەی بەسەر دەبرد و بڕوای بەخوا بوو بەتەواوی. ئیتر ئەوە بوو دواوادەی مردنەکەی کەوتە رۆژی یانزەی مانگی فێبریەری ساڵی ١٦٥٠.

## کەسایەتی دیکارت:

کەسایەتی دیکارت دەورە دراوە بە چەند چیرۆك و ئەفسانەیەك کە وا حکایە تخوان و نووسەران لە بارەیەوە دەیگێڕنەوە، لەوانەیە هەندێ لەو نووسەرانەی ئاماژە بۆ ژیان و گێڕانەوەی مێژووی بەسەرهاتی دیکارت دەکەن زیادەڕەوی و پێوەنانی تێدا بکەن، یان لەسەر شێوازێکی ناڕاست بیگێڕنەوە. بەڵام نموونەکانی ئەو هەواڵ و گێڕانەوانە هیچیان بۆ بنیات نانێکی راست و دروست نین سەبارەت بە ژیانی دیکارت، یان بۆپۆلێن کردنی قۆناغەکانی ژیانی هەوڵیان نەداوە، هەروەها خەڵکیش باوەڕ ناکەن بەو چیرۆك و بەسەرهاتانە و بەگونجاوی نازانن و ڕێکەوتن و هەم ئاهەنگیش نیە لە نێوان خەڵکانێکدا کە بچێتە عەقڵیانەوە دیکارت بەو شێوەیە بووبێت چونکە هەموو ئەو باس و خواسانە کە ئەوانە دەیگێڕنەوە و نووسیویانە دوورن لە خوو و ڕەوشت و هەڵس و کەوت و مەزاجی تایبەتی دیکارتەوە هەر وەکو زانراوە، مادام وای لێهات و حەز دەکەین کە ڕووە جیاوازەکانی کەسایەتی دیکارت بزانین ئەوا نابێ چاو لەو لایەنەش بپۆشین کە بە شێوەی ئەفسانە و درۆ و دەلەسە باس لە ژیانی دیکارت دەکەن، یان هەر هیچ نەبێت بەلانی کەمەوە نابێ هەندێ لەو شتانە پشت گوێ بخەین کە تێیا باسکراوە چونکە بۆ چەسپاندن و گونجاندنیان بۆ بەراوردکردن لەگەڵ هەڵس و کەوت و کارتێکردنە عەقڵانیەکانی دیکارت پێویستمان دەبێت. ئەو حاڵەت و بارودۆخانەی کە مێژوو نووسەکەی دیکارت "باییە" ئاماژەی پێدەدات چەسپاندنێکی واقیعی نیە بۆ کەسایەتی دیکارت و هەڵس و کەوت و ئارەزووەکانی، بێتوو گەر بڕوانینە گێڕانەوەکانی ئەوا دەڵێت: درێژی باڵای دیکارت لە خوار مام

ناوەندیەوە بووە، تەنانەت یەکێ لە ناحەزەکانی جارێکیان ئەم هەموو ناو ناتۆرانەی بۆ رێك دەخات و دەیهۆنێتەوە بۆ وەسف کردنی لەش و لاری و دەڵێ: سەری گەورە بووە، ناوچەوانی پان و هەڵتۆقیو بووە، قژی ڕەش بووە، قژی شۆڕ بۆتەوە بۆ خوارەوە بۆ سەر هەر دوو برۆکانی، هەر دوو چاوی زاق و کراوە بوون بە ڕادەیەکی زۆر ئەو زاقێتیەی چاوی هەستی پێکراوە، هەروەها لووتی زۆر گەورە و درێژ و دەرپەڕیوو بووە بۆ پێشەوە، دەمیشی گەورە بووە، لچی خوارەوەی کەمێ دەرپەڕیوە لە لێوی سەرەوەی، دەکرێ بووترێ دەم و چاوی سپی ڕەنگ بووە.

ڕەنگی ڕووخساری لەمنداڵیدا زەرد هەڵگەڕاو بووە، کەچی لە گە نجێتیدا شێوەی ڕەنگی سووربراو بووە، بەلام لەکاتی چوونە ساڵەوە و تەمەنی پیریدا ڕەنگی شێوەی پێستی ڕووانیویەتی بە لای ڕەنگی زەیتوونیدا. هەروەها لە دەم و چاویدا خاڵ هەبووە بۆ ماوەیەك دەرکەوتوون و پاش ماوەیەکیتر نەماون، ڕووخسار و دەم و چاوی تەعبیری لە ماناکانی تێڕامان و توووند و تیژی هەڵس و کەوتی کردووە.

دەنگی لاواز و نزم و شاراوە بووە بەهۆی ئەو لادانە سادەیەی کە لەسیەکانیدا ڕوویدابوو، ڕادەی خۆ ڕێك و پێك کردنی لە جل و بەرگ و ڕازاندنەوەیدا بەڵگەی ئەو چاودێری کردنەیە کە لە حاڵەتێکی شاهانە و تێر و تەسەل و پڕ بەختەوەریدا نەژیاوە. دیکارت بەدوای شتە ڕابردووەکاندا چووە، بەلام تەحەداشی نەکردووە. هەروەها ڕەنگی ڕەش خۆشەویست ترین ڕەنگ بووە بەلایەوە، لە کاتی سەفەردا کڵاوقوچێکی (کڵاوقازی)یەکی خۆڵەمێشی ئەرخەوانی لەسەر دەکرد.(١٥)

گەر بەشێوەیەکی کاتی ڕوانیمان بۆ ئەو وەسفکردنە ووردانەی لەش و لاری دیکارت کە ( بابیە ) باسی دەکات بە بەراورد ڕاگرین لە گەڵ ڕوانینمان لەسەر وێنەی دیکارتی پیشاندراو لە مۆزەخانەی لۆڤەر لە پاریس ئەو کاتە دەبینین لە وێنەی ناو مۆزەخانەکە دا شێوەی ڕووخساری بەم جۆرەیە : دەبینین سەری لە شێوەی خاچدایە و هەر دوو چاوی چووە بە قوڵدا و لووتی بەرزاییەکی تێدایە، هەروەها چەناگەی درێژ و ڕەق و تەق وەك شوڵكەدار وا بووە کە نیشانەی هێزی ئیرادە و خۆڕاگری ئەوی پیشانداوە. هەموو ئەو مەلامیحانەی دیکارت وا لە نێو ئەو وێنە قسەکەرەدا بەرجەستە کراوون بەڵگەی ئەوە پیشان دەدەن کە ئەو کەسە خاوەنی هێزێکی ناوەکی بڕوا پێکراو بووە لە بارەی چالاکییە ڕۆحیە بازدەر و تێپەڕێنکراوەکانیەوە، لەگەڵ بەدیکردنی تێڕامانی قووڵ تێیدا و بەردەوامبوون لەسەر فیکر و گۆشەنیگای بۆچوونەکانی.

( بابیە ) بۆی زیاد دەکات لەم بارەیەوە دەڵێت: دیکارت لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنیدا دەستی کرد بەکەم کردنەوەی ئەو خواردنانەی کە لە ئێواراندا دەیخوارد چونکە شەو پێی نارەحەت و تەنگاو دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکەمی ( مەی ) دەخواردەوە و بۆ ماوەی چەند مانگێك وازی لە خواردنەوەی هێنابوو. هەروەها لە خواردنی گۆشت دوورە پەرێز بوو هەر چەندە بۆ گەشە پێدانی چالاکی و پێویستیەکانی لەشی گرنگ بوو، بەڵام زیاتر گرنگی دەدا بەخواردنی میوە و سەوزە، لەو بڕوایەشدا بوو گۆشتی ئاژەڵ پێویستە بۆ چاکردن و گەشە پێدانی ژیانی مرۆڤ. ماوەی خەوتنی لە نێوان دە تا دووانزە سەعات بوو، ژووری خەوتنەکەی بەجێ نەدەهێشت و بەیانیان خۆی پێوە خەریك دەکرد و نانی تێدا دەخوارد پاشان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك خۆی خەریك دەکرد بە گفت و گۆ و قسەکردن و کشت وکاڵی ناو باخچەکەیەوە، یان

زۆربەی كاتەكانی خەریكی وەرزشكردن بوو لەسەر پشتی ئەسپ. لەسەعات چواری بەرەبەیانەوە تێ هەڵدەچووە ئیش و كارەكانیەوە و تادرەنگانێكی شەو خۆی پێوە خەریك دەكردن.

لە دیكارتدا ئەوە بەدی دەكرێت لەگەڵ هاوڕێ و دۆستەكانیدا زۆر بەڕێز و سەر و زمان شیرین بووە و خزمەتی كردوون.( ١٦ ) هەروەها هەڵس و كەوتی لەگەڵ خەڵكیدا هەڵس و كەوتی پیاوێكی بەخشندە و بەویقار بووە، شوێنێكی زۆر بەرز و بڵندی بۆ هاوڕێیەتی و دۆستایەتی تەرخانكردووە لە دڵیدا و ئەوە بە گەورەترین نیعمەتەكانی ژیان دادەنێت كاتێ گوێ دەگرێ لە وتووێژی ئەو كەسانەی وا ئەویان خۆش دەوێت و ڕێزی لێدەگرن.( ١٧ )

ئەوەش بە ڕوونی دیارە كاتێك وەڵامی هێرش و ڕەخنەكانی دوژمنانی دەداتەوە چاوپۆشی دەكات لە بەكارهێنانی دڵڕەقی و توندوتیژی بەرامبەریان، هەندێ جاریش بە دەبەنگ و نەزان وەسفیان دەكات و بەگەوج و گێلێتی و نیەت خراپی خۆیان بەرپەرچیان دەداتەوە، تەشقەڵە و گاڵتە پێكردنێكی جەرگ بڕ و سووتێنەریان ئاڕاستەدەكات. لەو نموونە تەشقەڵە و گاڵتە پێكردنانەی دیكارت یەكێكیان دەگێڕینەوە ئەویش بریتیە لەم ڕووداوە: یەكێ لە قەشە هۆڵەندیەكان ناوی "ڕفیۆس" دەبێت، كاتێ گومان دەكات و دەزانێت فەیلەسووفێكی فەرەنسی كۆچی كردووە بۆ هۆڵەندا و حەز و ئارەزووی لەوەیە بێتە سەر بیر و باوەڕی پرۆتستانی و واز بێنێت لە بیر و باوەڕی كاتۆلیكی. كاتێ "ڕفیۆس" ئەمە دەبینێت دەیەوێ لێكۆڵینەوە لەسەر حەز و ئارەزووی بكات و ڕایكێشێت بە لای خۆیدا و زەوتی بكات، بانگهێشتێكی گەورەی پرۆتستانتی بۆ دەكات لە هۆڵەندا و دیكارتیش كرانەوە و ئامادەبوونی خۆی بۆ نیشاندەدات لەو حاڵەت و بڕیارەدا، بەڵام دیكارت

بەرپەرچی داواکاریەکەی قەشە دەداتەوە بەچاوفڕین و دڵەکوتێوە و پێی دەڵێت: لەبەر ئەوەی من فەرەنسیم مانای ئەوەیە دەبێ بەدڵسۆزی بمێنمەوە لەسەر دینی پادشاکەم (مەلیکەکەم). وا دەردەکەوێت کە "ڕفیۆس" باش حاڵی نەبووە و تێنەگەیشتووە لەو شێوە وا بەستەبوون و لێك جیا نەبوونەوەیەی دیکارت کە هەییووە بۆ دینی مەلیکی فەرەنسا، لەبەر ئەوە دووبارە پرسیاری لێدەکاتەوە لە بارەی ئەم هۆکارەوە، ئەوسا دیکارتیش وەڵامی دەداتەوە بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕی و تەشقەڵە ئامێز و پێی دەڵێت: دووبارە بەدڵسۆزی دەمێنمەوە لە سەر دینی ئەو کەسەی کە شیری پێداووم!

لە ڕوانگەی دیکارتەوە زانست لە شێوەی چەکێکی دوو سەر یان دوو دەم دایە: دیکارت خۆی پاراستووە لە زانستی تەڵقین دار و بەلام لە هەمانکاتدا حەزی کردووە لە فێربوون و وەرگرتنی زانست، زۆر ترساوە لە دواکەوتن و فەشەل بوونی خۆی، هەمیشە لەهەوڵ دا بووە بۆ پێشکەوتن بەخۆڕاگری و ئیرادەیەکی پۆلایینەوە بەبێ ئەوەی ناچار بکرێت، لە بەر ئەوە خەونەکانی لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٦١٩ دا هاوتای ئەو گواستنەوەیە بوون کە لە قۆناغی گومان و سەرسوڕمانەوە پێیدا پەڕیەوە بۆ قۆناغی دڵنیایی و بڕواکردن، نۆبەرەی ئەم بڕواکردنە لەسەرەتای جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە سەری هەڵدا. بەلام نەك بەشێوەی حەماس و جۆش و خرۆشێکی واق ورماو لە بەردەم بڕیارێکی سەرسوڕهێنەردا بەڵکو لەشێوەی حەماسەت و جۆش و خرۆشی پیاوێکی بڕوابەخۆ بوو لە هێز و تواناکانی لەسەر تێگەیشتن و کارکردن.

لەوانەیە ئەم هێز و توانایەی لەو هێز و توانا ئەصیل و بنەڕەتیەی دەروونیەوە دەرچوو بێت، کە تەبعێکی پیاوانەی گرتووە لە ژیان و هەموو کار و کردەوەکانیدا، وە لە هەموو بەدەنگ هاتن و وەڵامدانەوەکانیدا بۆ ڕووداوەکان،

دیسان لە نووسین و بیرکردنەوە فەلسەفیەکانیدا. دیاردە و ڕواڵەتەکانی هێز لای دیکارت بەشێوەی ڕاشکاوانە و ڕوون و ئاشکرا نەبووە، وەك ئەو ڕووخۆشی و سیاسەتەی هەبیووە لەگەڵ ئەوانەدا و زانیویانە بەهێز و تواناکانی، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەوانەدا کە نەیناسیوون لە شێوەی دان پیانان و قسە وگفت و گۆی زانایەکی بیرکاری فەرەنسی دابووە، هەروەها هەڵس و کەوتی لەگەڵ یەسوعیەکانیشدا بەشێوەیەکی تایبەت بووە. دیکارت مەدح و سەنای ئەوانەی کردووە کەوا لێی نزیك بوونەتەوە لە هاوڕێییەتیدا، لەهەمان کاتیشدا هێرشی نەکردووەتە سەر ئەوانەی وا هێرشیان کردووەتە سەر یان سەرپێچیان بەرامبەری کردووە، بەهیچ شێوەیەك لە شێوەکان نەچۆتەوە بە گژیاندا و نەییوغزاندوون. بەلام بەرگری لە خۆی کردووە و بانگی ناحەزەکانی کردووە بۆ دانیشتن و گفت و گۆ و ڕاگۆڕینەوە لە گەڵیاندا و لەم کارەشیدا ئەمەی وەك هەلێك بەکار هێناوە بۆ ڕیکلام لە بارەی زانست و فەلسەفەکەیەوە.(١٨)

لەو دیاردە و دەرکەوتە ناڕاستەوخۆیانەش بۆ هێز و تواناکانی دیکارت کە هەستی پێدەکرێت ئەو ئیرادە و خۆڕاگریەیەتی کە لە کاتی دابڕان و دوورکەوتنەوەی لە فەرەنسا هەستی پێدەکەین بە شێوەیەك خۆی دوورە پەرێز و گۆشەگیر کردووە بەرامبەر سەردانەکان و کۆڕ و کۆبوونەوەکان، حەزی لە بێدەنگی و ئارامی و دڵنیایی کردووە. پاشان دەبینین لە دوای ئەم حاڵەتەوە شوێنی نیشتەجێ و ماڵ و حاڵەکەی بە جۆرێك شاراوە و نادیار بووە تا ئەو ڕادەیەی ئەوانەی وا نامە و وتارەکانی خۆیانیان بۆ دەنارد لە ڕێگەی کەسێکیترەوە کە بەو کارە هەڵدەسا دەگەیشتنە دەست دیکارت خۆی.

هەروەها لە سەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بووە لە کاتی مانەوەشیدا لە هۆڵەندا بەجۆرێك لە ماڵێکەوە دەیگوازتەوە بۆ ماڵێکی‌تر و لەشارێکەوە بۆ شارێکی‌تر بۆ ئەوەی کەس بە ژیان و گوزەرانی نەزانێت تەنانەت ناسیاو و دۆستەکانیشی یان دەرودراوسێکانی. دیکارت بە تەنیشت ئەم تەنهایی و دابڕانەشیەوە خۆی زۆر دەپاراست لە هەموو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان. هەروەها دیکارت دانی بەوە دانابوو کە قسەکردن و نووسین ئەو دوو بێگارەن (یان ئەو دوو تەشقەڵەیەن) ئەوەندەی دەکرێ و دەگونجێ ئەبێ بەگژیاندا بچینەوە بۆ ڕزگاربوو نمان لێیان. هەروەها بەگریمانەی دیکارت مەیموونەکان ژیرترین دروستکراوەکانی بوونەوەرن بێتوو گەر بیر و باوەڕی وەحشی و کێویلەکان لە بارەیانەوە ڕاست بێت چونکە ئەوان خۆیان بە دوور دەگرن لە قسەکردن تەنانەت ئارەزووشیان لە ئیشکردن نیە بە درێژایی کات.(١٩)

هەندێ خاو و خلیچکی و خەم ساردی بەدی دەکرێت لە دیکارتدا بەوەی کە وای دادەنێت خاڵیە لە هەڵچوون و سۆزداری، بەڵام دیکارت خۆی ئەوە بە دی دەکات کە هەڵچوونەکان (بزواندنەکان) سوود بەخشێکی پێوستن، بۆیە لەڕوانگەی ئەودا ئەگەر هەندێ لە هەڵچوونەکان سەرچاوەی شپرزە بوون و ئاژاوە بن ئەوا هەندێکی‌تریان دەبنە سەرچاوەی هێز و توانا. بێگومان تووڕەبوون زیانی هەیە بۆ دەروون بۆیە دەبێ قەرەبووی بکەینەوە بە وەلانان و دوورکەوتنەوە لیێ. هەروەها یەکێ لە پاشماوە خراپەکانی تووڕەبوون قیزهاتنەوەیە لیێ، هەروەها خۆشەویستی ئەو شتەیە کە (عاشق) یان دڵدار ڕەوانە دەکات بۆ دروست کردنی ڕق و کینە بەرامبەر هەموو شتەکان تەنها بەرامبەر خۆشەویستەکەی نەبێت، هەر لە بەر ئەوەشە ستەم دەخاتە سەر

ژیانی عاشق و جیهانەکەی و بزری دەکات (وون دەبێت) لە سەر بڕیاردان و جیاکردنەوە لە نێوان شتەکاندا.

بەلام لێرەدا جگە لەم خۆشەویستییە کەف و کولدار و هەلچووە پالْ پێوەنراوە، سۆزداریی خۆشەویستی بەرەو کەسانیتر خۆپەرەستی تێدا نییە. ئەمەش ئەو خۆشەویستیەیە دیکارت هەستی پێدەکرد بەرامبەر هاوڕێکانی وەك: (شانو) و (شاژنە ئەلیصابات) بەشێوەیەکی تایبەت. بوونی پەیوەندیەکەی بە (شاژنە ئەلیصابات)ەوە سەرەتای قۆناغێکی نوێبوو لە ژیانیدا و بوو بەسەرچاوەی ئیلهامێکی فەلسەفی نوێ بۆ دیکارت. شاژنیش بە دەوری خۆی هەلدەسا بە گێڕانەوە و باسکردنی هەموو شتەکان بۆی لە دیدێکی ڕاستگۆییانە و دلسۆزیەوە خەم و ئازارەکانی خۆی و کارتێکردنی شتەکانی دەوروبەر لە سەر دەروونی دەخستە پێش چاوی دیکارت. لە ئەنجامی لێکۆلینەوە لە بارودۆخی دەروونی شاژن و بەدواداچوونی هەلچوون و کاردانەوەکانی و ئەوەی پێویست بێ بۆ چارەسەرکردنی، دیکارت گەیشتە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك ئەویش ژیاندنەوەی دلنیایی و ئارامی بوو لە دەروونی شاژندا، کەبێگومان دەبێتە هۆی ئاسوودەیی و بەختەوەری بۆی و بۆ کەسانیتریش جگە لە ئەو.

دیکارت کاتێ ڕۆچوو بوو لە ناخ و قولبوونەوەی کاردانەوە دەروونیەکانی شاژندا ئەو سەرنج و تێبینیانەی لا گەلالە بوو کە لە توانا دا نیە دەروون ڕزگار بکرێت لەکاردانەوەی خراپ تەنها ئەگەر بەهۆی هێزی دەروونی ڕەسەنەوە (ئەصیلەوە) نەبێت. بۆ ئەو هێزەش زمانی خۆی و نیشانەکانی کاردانەوە سۆزداریەکانی خۆی هەیە و گرنگترینیان بریتیە لە شادی و هیوا و موژدە پێدان. ئەمەش بەمانای ئەو دەنگ و بانگ کردنانە دێت کە ئەو دەروونە

دەبییستێت لەسەر بڕواكردنی بەڕووداوەكان و واق وڕمانی بەشێوەیەكی گونجاو.

دیكارت دەروونی خۆی چوواندووە (شوبهاندووە) بە سوقرات و دانی بەوە داناوە كەچەند جارێك گوێی لەو دەنگانە بووە لە دەروونی خۆیدا و بەشێوەیەك تێبینی كردووە لە تووشبوونی بەدڵەكوتێ و نائارامی لە هەندێ بۆنەكاندا بەوەی كە ئیش و كارەكانی پشت گوێ خستووە بە پێی ئیلهامی خۆی، هەروەها هەستی بە مەترسی ئەو نالەباریە كردبوو كە لە پرۆژەی دواسەفەری كۆتاییدا بۆ وولاتی سوید هاتە ڕێگای و بوو بەهۆی مردنی. بەڕاستی دیكارت پیتۆڵێكی تا بلێی ژیر و لێوەشاوە بوو بە هەموو مانا قووڵەكانی ژیری و دانایی. ئەو تاكە دەنگەش بوو كە هەرگیز لەیاد ناچێت. لە دەروونیدا زۆر لە نیشانە دەركەوتوەكان هەبووە كە لە ئەركەكانیدا بەرجەستەی دەكرد. پێویستە چاكە و لە پێشبوونی هەندێ لەو نیشانانە بدەین بە سەر هەندێكی‌تریاندا. لە حاڵەتی گەشتەكەی دیكارتدا بۆ سوید كە بوو بەهۆی كۆتایی هێنان بە ژیانی و خۆشی هەستی بەۆ ترس و لەرزە كردبوو كە دێتە ڕێگای و بۆی دەبێتە بەڵای ناگەهان، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هیوای بە كەڵك و سوودێكی هێجگار گەورە هەبوو كە لەو سەردانەدا تووشی دەبێت، كەڵك و سوودێكی وا كە پێشكەشی كەسانی‌تری كرد بە هۆی فێركردنیانەوە بەزانستی پرۆگرام و فەلسەفەی حەقیقەتەوە لەسەردەستی خۆیدا، ئەو كەڵك و سوودەش وا خۆی پێی گەیشت و بوویە هەڵگری بە تایبەتی لەو سەردانەیدا بە دەستی هێنا لە ئەنجامی چاودێریكردن و برەودانی بە بیر وباوەڕ و پرۆگرامەكەی خۆی. مادام لەو بڕیارو حاڵەتەدا هیواكان و كەڵك و سوود و خێر و چاكەی تێدا بووە بۆ خۆی و كەسانی تریش، كەواتە ئەوانە هەمووی سەلمێنەری

نیشانەكانی دەروونێكی بەهێزن كە لەدیكارتدا هەبووە و جێگـای ئـەوەی تێـدا نابێتـەوە كـە بەرپەرچـی ئـەو گەشـتەی بدایەتـەوە و هەڵنەسـایە بـە ئەنجامـدانی. هـەر چـەندە لەگـەڵ ئەوەشـدا تـەوەقوعی ئـەو نالـەباری و ناڕەحەتیەی كردووە كە لەو گەشتەدا یـان هـەر گەشتێكیتریدا دێنـە ڕێگـای، بەڵام ئەو لە هیچ شتێك نەترساوە، ئەو لەمردن نەترساوە بەجۆرێكی تایبـەت بەڵكو ژیانی خۆشویستووە بـە هـەموو خێـر و بێرەكانیـەوە.(٢٠) خۆشویسـتنی ژیان و ترس دوو شتن پێكەوە كۆ نابنەوە.

ئەوە بەدی دەكرێت لە دیكارتدا هەر چەندە لەگەڵ ئەوەشدا لەش و لارێكی لاواز و بـاری تەندروسـتی بـاش نـەبووە، لەگـەڵ ئـەو ئـارەزووە ڕوون و ئاشكرایەشیدا كە هەییبووە بۆ ژیـانی خۆشگوزەرانی و بیركردنـەوە و تێڕامـان، پیاوێكی خاوەن ئیرادەی بەهێز بووە كە پێوانە نـاكرێـت، وە دەروونـی هەمیشـە وریا و بەئاگا بووە بۆ خەبات و تێكۆشانی بەردەوام و نە پچڕاو، بەدڵنیاییـەوە دیكارت كەمتەرخەمی نەكردووە لە بەدەست هێنانی كـات و خۆتـەرخان كردنـی بۆ نەخشەكێشانی وێنەی بیروباوەڕە فەلسەفیەكەی، تەنانەت تا ئەو كاتـەش خۆی مابوو لە ژیاندا و نزیك بوویەوە لە مـردن درێغـی نـەكرد لـە سەرخسـتنی فەلسەفەكەی و بانگهێشتی بۆ دەكرد بە هەموو شێوەیەك هـەر چـەندە زۆریـش بكەوتایە لەسەری لەو حاڵەتەدا هەر تێكۆشان و فیداكاری خۆی لەو پێنـاوەدا ئەنجام دەدا. هیچ نارەزایی دەربڕین و ڕەخنەیەكی بێوەڵام بەجێ نەدەهێشت و هەر هەموویانی وەڵام دەدایەوە، وەڵام دانەوەیـەكی بڕوا پێكـراوی زانایـەك بـە نرخـی فیكـر و بۆچـوون و بـیر و باوەڕەكـانی، داوای پشـوویەكی نـەدەكرد تـا هەلێكی تێدا بقۆزێتەوە بۆ پاڵپشتی كردنی بنەماكانی فەلسـەفەكەی، بەڵكـە

و بۆچوونەکانی لایەنگرانی خۆی بە هێز دەکرد و بنکەکانی سەرپێچیکەرانیشی تەفر و توونا دەکرد.

گومانی تێدا نیە کەسایەتی دیکارت لەو کەسایەتیە ئاڵۆزانەیە تا ئەوپەڕی ئاڵۆزی، بۆیە هەڵەیە گەر بمانەوێت بەتەنها کلیلێك دەرگاکانی ئەو کەسایەتیە بکەینەوە. چونکە دیکارت لەو کەسانە بوو کە خاوەنی تێڕامان و تێڕوانین بوو هەروەك "مالبرانش" دەڵێت. هەروەها سوارچاکێکی فەرەنسی بوو لە ئەهلی سوارچاکی فیکریدا هەروەك "شارڵ بێجی" دەڵێت، هۆگری سەرکێشیە زیهنیە پاڵفتەکراوەکان بوو، هەروەها پیاوی کار و فەرمانیش بوو. ژیانی خۆش دەویست، گرنگی دەدا بە تەندروستی جەستە و خۆشگوزەرانیەکانی ژیانی، پاشان دیکارت خۆی ئەو پیاوە بوو کە خاوەنی پەیامێکی سەرقاڵ و جە نجاڵ بوو بۆ سەرکەوتنی بیر و باوەڕەکەی لە پێناوی خزمەتکردنی هەموو مرۆڤایەتیدا، دیسان لە سەرووی هەموو ئەم شتانەوە ڕابەرێکی بەڕێز و ڕۆشنبیر و نەرم و نیان و تێگەیشتوو بوو یان جەنتلمانێکی شارەزا و کارامە بوو بۆ ئەهلی زەمانی خۆی، بەلایەوە خۆش بوو قسەکردن لەگەڵ ژندا، دوا نەدەکەوت لە زۆرانبازی لەگەڵ پیاواندا لە پێناوی ئافرەتێکدا ئەگەر خۆشی بویستایە، شەرمەزار و تەریق نەدەبوویەوە گەر پەیوەندی ناشەرعی (نایاسایی) بکردایە بە چەند خانمێکەوە و منداڵی ناشەرعیشی لێیان ببوایە.

هەروەها یەکێ بوو لە ئەهلی ئەرستۆکراتی فیکری، گاڵتەی دەهات بەو زانین و زانیاریانەی بەکورتکراوەیی لە دەقی کتێبەکانەوە وەردەگیرا، لە ڕۆژێکدا چەند سەعاتێکی تەرخان دەکرد بۆ توێژینەوە زانستیەکان، هەروەها لە ساڵێکدا چەند ساعەتێکی تەرخان دەکرد بۆ توێژینەوە میتافیزیکیەکان یان توێژینەوە لە ئەویوی سروشت.

بەشێوەیەكی گشتی دیكارت پیاوێكی زاڵ بووە بەسەر زانست و فەلسەفەكەیدا و بەوە قایل نەدەبوو خۆی دوور خاتەوە لێیان. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەگرێكی ئازاد بوو، ڕقی بوو لەوانەی خۆیان بەسەنگین و سەلار یان خۆیان بە زل و ترۆفیزەوە پیشان دەدەن، لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە دیكارت مەسیحی بوو، دریغی نەدەكرد لە بەجێ هێنانی ئەركە ئایینیەكانیدا، نابێ ئەوەشمان بەلاوە سەیر بێت كە دیكارت یەكێ بووە لەو حاجیانەی كە ڕۆشت بۆ "نۆتەردام دولۆریت"، بۆیە كاتێ گەیشت بەیەكەمین سروشی (وەحی) فەلسەفەكەی لەگۆشەنیگایەكی بەناوبانگەوە بیرو باوەڕی بەوە هەبوو كە ئەوە لە لایەن خواوەیە، بۆیە یەكێ بوو لەوانەی خۆی دەپاراست و پێداگیری دەكرد لەسەر دووركەوتنەوە لە شتە ناپەسەندەكان بەهەموو جۆرەكانیەوە و خۆخەریك كردن بەدنیاوە، دەست لە ملانی بێدەنگی بوو تا فەلسەفەیەكی شیاو و گونجاوی بۆ بەرهەم هات بۆ وەڵامدانەوە و بەرپەرچ دانەوەی بەرهەڵستی كارە هۆڵەندیەكانی.(٢١)

بەدڵنیاییەوە دیكارت لە ژیانیدا هەموو لێدانەكانی سەركەوتن و هەموو ڕەنگەكانی نسكۆ و نوشوستی فێر بوو. بۆیە ئێستا فەلسەفەكەی بۆتە فەلسەفەیەكی مرۆڤایەتی وا كە سنوورەكانی كات و شوێن دەبەزێنێت. وێنەی ئەو لاپەڕە دیار و ئاشكرایانە دەكێشێت كە بە لاپەڕە نەمرەكان دادەنرێت لە مێژووی مەعریفەی مرۆڤایەتیدا. هەروەها سەرەتاكانی فەلسەفەی دیكارتی سەرچاوەیەكی بە پیتی ئیلهام بەخش بووە بۆ گەورەزانایان (عەبقەریەكان) و بیرمەندان (موفەكیرین) و فەرمانڕەوا و دادوەر و ژیر و داناكان لە سەدەی حەڤدەهەمدا، تەنانەت تا دەگاتە ئەم چەرخەی ئێستاشمان دادەنرێت بە باوكی ڕۆحی هەموو فەیلەسووفەكان ئەوانەی وا لەدوای ئەو هاتوون، مێشكی

**خۆیان پڕ كردووە لەو بۆن و بەرامە عەقڵانیە كاریگەرەی بـوون و هەبوونـەكان ( الوجود و الموجودات ).**

## دیكارت و بەرنامە عەقلانیەكەی:

بەرنامە بریتیە لەو رێگا پێویستەی كە لە توێژینەوەی عەقلیدا دەگیرێتە بەر. گرنگیدان بە بەرنامە و چاودێریكردنی دائەنرێت بە جیاكەرەوەیەك لە جیاكەرەوەكانی سەدەی حەڤدەهەم، چونكە بیرمەندانی ئەو سەردەمە باوەڕیان بە سوود و قازانجەكانی بەرنامە و كارلێكردنەكانی لەسەر زانستەكان و ژیانی رۆژانە و هەموو رۆڵەكانی مرۆڤایەتی هەبووە. بۆیە "هاملان" ئاماژە بۆ هۆكاری ئەمە دەكات و دەڵێت: خەڵكی ئەو سەردەمە لەكاتی تەمەنداری و چوونە ناو ساڵیانەوە دەچنە ژێرباری مل كەچ كردن بۆ دەسەڵاتەكان لە فەلسەفەدا، بەڵكو هەندێ جار ئەمە لەبیر و بۆچوونی هەموو خەڵكیدا دەچەسپێت و دەچێتە ئەو بیر و باوەڕانەوە كە هەر چیەك بن، بێگومان ئەمەش هەر چۆنێك نەبێت شتێكیان لا دروست دەكات كە دڵنیایی و ئۆقرەیی خۆیانی پێ دابین دەكەن، بەرنامەش دەبێتە كەفیلی ئەمە هەرچەندە ئەوانیش فیكر و بۆچوونیان لەبارەی ئەو ( بەرنامە )یەوە دەوڵەمەند نەبێت.( ٢٢ )

دیكارت ئەوەی بەچاوی خۆی دەبینی كە توێژینەوە و لێكۆڵینەوە لەبەرنامە بریتییە لە گرنگترین كێشەكان و پێویستی بە یارمەتیدان و چاودێری كردن هەیە لە بەجێهێنانی ئەركەكانی فەیلەسوفدا، بۆیە لە سەرەتاوە دەیویست وا بكات لە چاكسازیە فیكریەكەی پەی بەرێت بە رێگایەك تا بەهۆیەوە بگاتە سەر مەعریفەی حەقیقی، بەهۆی ئەو رووناكیە فیطریە ( خواكردە )ی كە لە مێشك و عەقلی هەمووماندا پەخشكراوە ئەوەش رووناكی عەقڵ و ئاوەزە. دیكارت رازی نەبوو لە بەرنامەی فەلسەفەی كەلامی ( واتە

تەنها بەقسەكردن بێت )، فەلسەفەی مامۆستاكانی ئەو بەرنامەیە تەنانەت تا ئەو سەردەمەی دیكارت خۆشی هەر مابوو، بریتییە لەو فەلسەفەیەی كە دەووترا بە دیكارت لەسەردەمی قوتابیێتیدا كە دەچوو بۆ وەرگرتنی زانست لە قوتابخانەی ( لافلیش ).

ئەوەش لەو كاتەدا بریتی بووە لە هەوڵدانێك بۆ نەهێشتنی كێشە فەلسەفیەكان یان زانستیەكان بەباسكردنی كۆمەڵێك لەو وتەی نووسەرانی پێش خۆیان جا ئەو نووسەرانەش ناسراو و ناودار بووبن یان بە پێچەوانەوە نەناسراو بووبن، ئەمەیان وەك ئەڵتەرناتیڤێك بەكارهێناوە لە جیاتی ئەوەی بێن و هەنگاو هەڵگرن بۆ چارەسەركردنی خودی كێشەكانی خۆیان. بەرنامەی لەم شێوەیە خوێندنەوە و ماندووبوونی زۆری دەوێت، جیاكردنەوەیەكی گەورەی دەوێت لە فێربوون و تێگەیشتن و شارەزا بوون بۆ گونجاندن لەنێوان بیر و ڕا لەیەكچووەكان و سەرچاوە هەمەجۆرەكانیتردا، بەلام بەرنامەی وەك ئەم شێوەیە لە توانایدا نیە ئەو هەستە لە خەڵكیدا بەرجەستە بكات لەسەر ئازادی فیكر و سەربەخۆیی لە توێژینەوە و لێكۆڵینەوەدا. گەر سەرنج بدەین دەبینین لەسەرەتای ئەو حاڵەتەدا دیكارت نیگەران و بێزار بووە لە كاتی خۆیدا لەو جیاوازیانەی كە هەبووە لە گۆشەنیگاكانیاندا و هەروەها بێزاریش بووە لە پشێوی نێوان بیر و بۆچوونەكان جا لە فەلسەفە دابووبێت یان لە زانستەكاندا بووبێت یاخود لە ئایین دا بووبێت، تەنانەت ئێمەش ناتوانین شتێك بدۆزینەوە كە ئەو شتە بریتی بێت لە شتێكی ئاشكرا و دڵنیاكەر بە جۆرێكی وا پێویستی بەوە نەبێت كە پەنا بەرێتە بەر گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە لە سەری.

بەدڵنیاییەوە پشێوی نێوان فەیلەسوفەکان و تێکەڵچوونی زانایان و ناکۆکی پیاوانی ئایینی، سەرچاوەکەیان هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازی پەیڕەوکردنەی کە لە توێژینەوەکانیاندا لە سەری دەڕۆن کە لەسەر ئاستێکی بەخشش و یارمەتیدان نیە، هەر بۆیە پێکدا هەڵدەپژێن بە پێکدا هەڵپژانێکی کوێرانە، هەر بەخاتری ئەوەی کە پشت بەستنەکانیان لەبواری گەیشتن بە مەرام و داخوازیەکانیان سەر بگرێت لە سەر جۆرە وەرگرتن و بەدەست هێنانێکی ڕێکەوت و بەختەوەری، بەبێ ئەوەی لەم کارەیاندا هیچ پلان و نەخشەیەکی وێنەبۆکێشراو یان بەرنامەیەکی دیاریکراویان هەبێت، خەڵکی پەلکێش کراوون بۆ ئارەزوویوونیان لە خۆدەرخستنێکی کوێرانەدا، تەنانەت بەجۆرێك گوێی خۆیانیان بۆ ڕادەگرن (گوێ قوڵاخ دەبن لەئاستیاندا) کە زۆرینەی جار لە ڕێگەیەکی ون و شاراوەوە ڕوو دەدات، هیچ لێکۆڵینەوەیەك ناکەن لەسەر هیوای پڕبوون و گوێ ئاخنینەکەیان، بەڵکو هەر لەشێوەیەکی خواوەکیلی ڕایان دەکێشن سا ئەمە خوایە بەڕێکەوت لە توێژینەوەکانیاندا لەسەریان شتێکی ڕاست دەرچێت، نموونەی ئەمانە لێرەدا وەك نموونەی ئەو پیاوەی لێ دێت کە ئارەزوویەکی شێتیگەری دەستی کێشابوو بەسەریدا لەسەر ئەو بڕوایەی کە وا گەنجینەیەك دەدۆزێتەوە هەر چۆنێك و لە هەر ڕێگایەکەوە بێت.

بۆیە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارەی دەتبینی هەمیشە خۆی خەریك کردووە بە گەڕان و سووڕانەوە بە هەموو شوێن و کون و کەلەبەرێکدا سا بەڵکو چاوی پێ بکەوێت یان بیدۆزێتەوە ئەو گەنجینەیەی یەکێ لەگەشتیاران یان ڕێبواران بەجێی دەهێڵن و بزری دەکەن!(٢٣) هەروەها ئا بەم شێوەیە ئەمە حاڵی زۆرینەی ئەوانەیە کە سەرقاڵی خۆخەریك کردنن بە لێکۆڵینەوەکان و

زانستەکانەوە. نەخێر! مرۆڤ گەر لە پێشدا بەرنامەیەکی نەبێت لەسەر بنەما و بابەتەکانی بڕوات، جا لەفیکر و بیرکردنەوە دا بێت یان لە ژیانیدا، ئەوا هەرگیز ناگات بە حەق و ڕاستی مەگەر بەڕێکەوت، وە هەست بەسەرکەوتن ناکات تەنها بەلێك ترازانێك نەبێت لە ترازانەکانی (لەدەست دەرچوونەکانی) بارودۆخ یان بە هۆی ڕەزامەندیەکان و یاوەرەیەکانی بەخت و تالعەکانەوە بێت (بەخت یاوەری بێت). وە خێر و چاکەی مرۆڤ لەوەدایە کە بەڕاستی و لەڕێگەی شایستەوە بگات بە حەقیقەت نەك لە هەوڵی ئەوە دابێت لە ڕێگەی بێبەرنامەییەوە بەدەستی بێنێت!

هەروەها خۆشەویستی خۆدەرخستن لە هەندێ خەڵکدا جاروبار پەلکێشیان دەکات بۆ ڕوودانی تەنگژە و قەیرانێك کە دەرچوونیان نیە لێی، وەك ئەوانەیان لێ دێ کە ملی ڕێگا دەگرن لەسەر لێکۆڵینەوەکان بە بێبوونی دەستوور و یاسا، بەرهەمی ماندوو بوون و کۆششەکەشیان بە هێندی ئەو ڕووناکی فیترەتە نابێت کە لە دەستی دەدەن و لە ئاکامدا تووشی زەین کوێری دەبن، چونکە ئەو لێکۆڵینەوانە بەبێ هیچ یاسا و ڕێسایەکی ڕێك و پێك و ئامادەکراو هەنگاوی بۆ نراوە، تێڕامانە شاراوە و ئەندێشە نادیارەکان ڕووناکیەکانی فیترەت پەردەپۆش دەکات و بینینەکانی زیهن دەکوژێنێتەوە، ئەوەش کە ڕاهاتووە لە سەر ئەم ڕێگا تاریکە بڕوات بەم جۆرە ئەوا ڕووناکی بینینی کەم و لاواز دەبێت بە لاوازبوونێکی وا کە وای لێدەکات زۆر بە ناڕەحەت بەرگەی ڕووناکی درەشاوە بگرێت. هەروەها ئەمەش ئەوەیە کە تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە. زۆربەی جار سەرنج دەدەین ئەوانەی وا سەرقاڵی لێکۆڵینەوەکان نین ئەوا بڕیار دەدەن بەسەر ئەوشتانە دا و وا پێشانیان دەدرێت و دەخرێتە بەر دیدگایان بڕیاردانێکی ڕاستر و پوختتر و ڕوون و ئاشکراتر زۆر

لەو بڕیاردانەی ئەوانەی وا زۆر دوودڵ و بەدگومانن لەسەر پەیمانگاکانی فێرکردن.

یەکەمین پێویستی لە ئامرازەکانی فەلسەفە هەست کردنە بە پێداویستی بەرنامە، پاشان دۆزینەوە و دانانی ئەو بەرنامەیە بە پراکتیکی ( عەمەلی )، پاشان چەسپاندن و جێبەجێکردن بەتیۆری و کردەیی، لەبارەی هەستکردن و هۆشیاری و بیروبۆچوون.

دیکارت دەڵێت: من ڕێنماییت دەکەم بەبەرنامەیەك بنەمایەکی ڕوون و ئاشکرا و ئاسانی هەیە بێتوو گەر مرۆڤ چاودێری بکات بەچاودێریکردنێکی ورد ئەوا لەو بڕوایە دادەبێت کەچی بەڕاست زانیوە و کامەی بەهەڵە داناوە، وە لە توانایدا دەبێت بەبێ‌ئەوەی هێزی خۆی جێبەجێ کات و بیسە پێنێت لەهەوڵ و تێکۆشانێکی وونبوودا ( واتە ڕەنج بەخەسار نابێت )، بەلام بە پێچەوانەوە لەگەڵ زیادبوونی زانیاریەکەیدا دژەزیادبوونێك ڕوودەدات، کە لە زیهنی دا دەگاتە یەقین ( دڵنیایی تەواو ) لەهەموو ئەو شتانەدا کەلە توانایدا نیە بیانزانێت.( ٢٤ )

دیکارت وای دەبینێت ئەو ئیشەی بەهاوبەشی چەند کەسێك ئەنجام بدرێت هەمیشە کەمتر کامڵ و تەواو دەبێت لەو ئیشەی تەنها پیاوێك پێی هەڵدەسێت و ئەنجامی دەدات، هەروەها بۆیە لەسەر ئەم حاڵەتە کەم و کوڕی هەیە لەزانین و زانیاریەکانماندا. پرۆژە و دامەزراوەیەك نیە خاڵی بێت لەکەم و کوڕی ئەوەش بەهۆی زۆری ئەو مامۆستایانەوەیە کە پەرتەوازەن، بەڕای دیکارت بەرنامە لەڕاستیدا یەك بەرنامەیە و لەناو هەموو خەڵکیدا عەقڵی دروست و ساغ شتەکان ڕاست دەکاتەوە کە لەنێوان خەڵکیدا بەشکراوە، بۆ ئەمەش هەڵەیە لێکۆڵینەوە لەسەر زانستە پەرش و بلاو و دوور لەیەکەکان

بکەین، لەگەڵ ئەوەشدا ئیش کردن و خۆخەریك کردن بەچەند زانستێکەوە پێویستی بەچاککردن و جیاکردنەوەی سودمەندێتی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا هەیە. ئەو زانستانەش لە پشتگیری و هاوکاریکردنی یەکتر دا پاڵ دەدەن بە یەکەوە و ڕستنێکی پێکەوە گرێدراویان لێ دروست دەبێت لەم کۆکردنەوەیەشیاندا وا دەبێت هەندێ جار کەمتر چاودێری و تێچوونی بۆ بکرێت وەك لەوەی لەیەك دابڕێت و هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا جیا بکرێتەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر هەر یەکێکیان بکرێت لەسەر ئاستی خۆی.

لەبەر ئەوەی عەقلی مرۆڤایەتی یەکێکە لەڕوانگەی چەمکی دیکارتەوە، کەواتە گۆڕانی بەسەر دانایەت هەر چەندە بابەتەکانیش جۆراوجۆر بن لەوانەی وا مل کەچن بۆ ئەو عەقڵە. ئەمەش ئەوەیە کە گریمان و مەرج و جیاکردنەوە هەڵناگرێت، ئەوانەی وا خەڵکی بەناڕەوا بۆی دادەنێن. لێرەدا هەڵوێستی دیکارت پێچەوانەی هەڵوێستی زانایانی تایبەتمەندن وەك ئەمڕۆ دەیڵێن، بۆ زانستەکان و ناومرۆکەکانیان بەزانیارییە بەش بەشەکانەوە هیچ نرخێکی نابێت لەگۆشەنیگای ژیر و داناوە (حەکیم)ەوە هەتا نەیگەڕێنێتەوە سەر تاکە شتێکی وا کەخەڵکی هاوبەشی تێدا بکەن. ئەوەش عەقلی ساغە یان بڕیارێکی ئاشکرایە. (٢٥)

دیکارت بۆ ئەوە دەڕوات بێتوو گەر بڕیار بدات کە ژێری مرۆڤایەتی یەکێکە و هەروەها زیهنی مرۆڤایەتیش هەر یەکێکە و عەقلیش هەر یەکێکە، بۆیە لێرەدا هەر دەبێ زانستێکی دڵنیاکەریش (علم يقين) هەر یەکێك بێت، یەك بەرنامەش هەبێت بۆ گەیشتن بەڕاستیەکان لە هەموو حاڵەتە جیاوازەکاندا. بێگومان هەر دەبێ بپرسین ئەم زانستە لە کوێ بێنین و ئەم یەك بەرنامەییەش لە کوێ بەدەست خەین؟ دیکارت دەڵێ: ئەو لێکۆڵینەوانەمان

دەست ناکەوێت تا لێیانەوە شتمان دەست کەوێت تەنها ئەوە نەبێت چەند بیر و ڕایەکی گریمانەیین. نەزانینی تەواو چاکترە لە زانینی لەق و شپرزە، زانست نابێتە زانستێك هەتا ئەگەر دڵنیایی (یەقین)ی تەواوی تێدا نەبێت. چونکە مانای زانست بریتیە لە ئاشکرایی و دڵنیایی نەك درۆ و خەملاندن، نموونەی ئەو ئاشکرایی و دڵنیاییەش زانستی بیرکاریە بەبێ‌ناکۆکی. وە بەرنامەی داواکراویش بەرنامەی بیرکاریە، بەو ئیعتیبارەی بەرنامەیەکی سروشتیە بۆ بیرکردنەوە (فیکر)، بەڵگەشمان بۆ ئەمە بیرکردنەوەی ئەوانەیە کە سەرقاڵن بەزانستە بیرکاریەکانەوە. سەرکەوتنی زانستە بیرکاریەکان و بالابونی بەسەر زانستەکانی‌تردا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە بابەتەکانی ئاسانە، چونکە عەقڵی مرۆڤایەتی لەخودی خۆیەوە وەریگرتووە و دۆزیویەتەوە بەبێ‌ئەوەی پەنا بەرێتە بەر تاقیکردنەوەی هیچ شتێك، پاشان ئاشنایی لەگەڵ پەیدا کرد و هەنگاوی سەرکەوتوانەی بۆ هاویشت، چونکە دروستکراو نیە و تەنها مانا و وێناکردنە ڕوون و ئاشکراکانە و هیچ شاراوەییەکی تێدا نیە.

دیسان دیکارت دەڵێت: هیچ نارەحەتیەکی گەورە بەدی ناکەم لەوەدا کە توێژینەوە لە بارەی هەر شتێك لەشتەکانەوە پێویستی بەدەست پێکردن هەبێت، چونکە من خۆم ئەوەم لە پێشەوە زانیوە کە دەستمان پێکرد لە ئاسانترین شتەوە بوو ئەویش مەعریفە بوو، ئەگەر سەیرێکی نێوان هەموو ئەوانەی پێشوو بکەیت لەداخوازی حەقیقەت لەزانستەکان هەر ئەوانە توانیویانە ئەو داخوازیانە بەجێ بێنن کە هاوڕێی بیرکارین و هەر تەنها خۆشیان سەلماندنەکانیان دۆزیەوە و دەستنیشانی بەڵگەکانی دڵنیایی و ئاشکراییان کرد، گومان ناکەم توێژینەوەکانیان لەسەر خودی ئەو بەرنامەیە بڕوات.

دیكارت سەرنجی لەوەشدا بوو مەبەستی فەیلەسووف ئەوە نیە بیركاری هەر تەنها بۆ خودی خۆی فێر ببێت، یان بۆ دۆزینەوەی ژمارە نەزۆكەكان و شێوازە ئەندێشەییەكان، بەڵكو بۆ ڕاهێنانی زیهنە لەسەر ئەو بەرنامە وڕێگایانەی كە پێویستە فراوان و درێژ بكرێنەوە بۆ ئەو شتانەی كە زیاتر گرنگی و نرخیان هەیە. دووبارە بیركاری بەرهەمی بەرنامەیە لای دیكارت نەك خودی بەرنامەكە خۆی، هەموو خەڵك ئەوە دەزانن ئەو مەعریفە و زانینەی وا فیكر قەناعەتی پێیەتی و جۆش و خرۆشەكانی دادەمركێنێتەوە بریتیە لە مەعریفەی بیركاری. بۆیە ئەفلاتوون حەقی بووە كاتێك ( خۆ خەریك كردن و سەرقاڵ بوونی بە فەلسەفەوە لەو كەسانە قەدەغە كردووە كە هیچ مەعریفەیەكی بیركاریان پێنیە و لە بارەیەوە هیچ نازانن ). ئەم قەدەغە كردنە ئەفلاتوونیە هاوتای ئەو ڕاگەیاندنەیە كە دەڵێ پێویستە بەرنامە هەبێت.

فەلسەفە هەروەك دیكارت تێی دەڕوانێت هەوڵ و تێكۆشانێكە بۆ بڵاوكردنەوەی بەرنامەی بیركاری و درێژكردنەوەی بۆ كۆمەڵێك زانیاری مرۆڤایەتی كە فەلسەفە خۆی بەتەنها پێی ناكرێت هەتا عەقڵی لەگەڵدا بەكار نەهێنرێت بەكارهێنانێكی باش و دروست. ئا ئەوەیە بەرنامەی گشتی هەمەلایەن، ئەمەش دەكرێ لێكۆڵینەوەی لەسەر بكرێت، چونكە عەقڵی بڕیاردەر دوودڵی و گومانی تێدا نیە لە دەستنیشان كردنی بابەتەكەی، هەموو شتێك چاكسازی تێدا بكرێت بۆ خۆی دەبێتە بابەتێك، جا ئەو شتە سروشت بێت یان مرۆڤ بێت. هەموو زانستەكان گۆڕانیان بەسەر دا دێت تەنها عەقڵی مرۆڤایەتی نەبێت هەمیشە وەكو خۆی دەمێنێتەوە، هەرچەندە ئەو بابەتانەش هەمەجۆر بن كە توێژینەوەیان لەسەر دەكات، بە بێ ئەوەی ئەو جیاوازیە لەسروشتی خۆیدا گۆڕانی بەسەر دابێت زیاتر وەك لەو گۆڕانەی دێت

بەسەر جیاوازی نێوان شتەکاندا لەسروشتی ئەو خۆرەی کە ڕووناکیەکەی پەخش دەکات بەسەر شتەکاندا.( ٢٦ )

لەهەمووئەمانەوە دەردەکەوێت کە دیکارت ئامانجی ئەوە نەبووە بەرنامەکەی بەکورتکراوەیی بچەسپێنێت بەسەر تەنها زانستێکی وەك بیرکاریدا، بەڵکو ویستوویەتی بەرنامەیەکی گشتی ببێت و بتوانێت بیچەسپێنێت بەسەر هەموو زانستەکاندا، وە بەڵگەش بۆ ئەمە لێرەدا ئەوەیە ناونیشانی کتێبەکەی بەم جۆرەیە : "وتارێك لە حەقیقەتی ناو زانستەکانەوە". لەبەر ئەوەی زیهن ڕاهاتووە بە داواکاری بەرنامەیەکی ڕاست کەلە توانایدا بێت بیگوازێتەوە بۆ زانستەکانی تر جگە لەزانستەکانی بیرکاری، وە بتوانێت وێناکردنی تواناداری لەبیرکاری گشتی دا هەبێت.

لەوانەیە لەسەرەتای کارەکە دا ئەم هەوڵدانە خەیاڵی بێت، بەوەی کە مەحاڵ بێت گێڕانەوەی هەموو شتەکان بۆ حساب ( ژمێرە ) بێت، یان کێشە ئەخلاقی و ڕەوشتیەکان یا خود میتافیزیکیەکان بگەڕێنرێنەوە بۆ هاوکێشە جەبریەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێت چارەسەری کێشە جیاوازەکان بکرێت بەچارەسەرکردنێکی بیرکاریانە، ژمێرە ( حساب ) چیە لەڕاستیدا ئەگەر تەنها ئامێرێك نەبێت کە زانستی ژمێرە یان زانستی جەبر بەکاری دێنێت بۆ شیکردنەوەی کێشە تایبەتیەکانی ئەو دوو زانستە. ئەو زیهنەش ڕوو دەکاتە ژمێرە لەبەر پێویست بوونیەتی پێی لە دۆخێك لە دۆخەکاندا، لەگەڵ ئەمەشدا نابێت ئەو زیهنە خۆی پابەند کات و ببێتە کوێلەی ژمێرە ( حساب ).

گەر هاتوو بۆ زانستە بیرکاریەکان دڵنیاییەکی وا پەیدا بوو کە جیاوازی تێدا نەبێت و ئەو دڵنیاییەش کە وەریگرتووە لەو ڕێگایانەی ژمێرەوە نەبێت وا ئەو زانستانە پشتیان پێبەستووە، بەڵکو لە ڕوون وئاشکراییەکی تەواوەوە

بێت، ئاشکرایی ئەو مانایانەی کە دروستی دەکات، وە لەو ڕێکخستنەی دەیکات بۆ زنجیرەدانان و ڕیزبەندیکردنی ئەو مانایانە.

بۆ ئەوەی بتوانین دڵنیایی تەواو زیاد بکەین لەسەر هەر زانستێك کە یەکسان بێت بەو دڵنیایییە تەواوەی زانستی ژمێرە یان زانستی ئەندازە ئەوا پێویستە خۆمان سەرقاڵ و خەریك نەکەین بە شتیترەوە تەنها بەو مانا ڕوون و ئاشکرا و دیارانەوە نەبێت کە ناوەڕۆکەکەیان تەواو ئاشکرایە بەمانای ئاشکرایی، هەموو ئەو مانایانەش ڕێك و پێك دەکەین و ڕیزیان دەکەین، یان ڕێکیان دەکەین بەڕێکخستنێکی تایبەتی، بەشێوەیەك هەر مانایەك لەو مانایانەی کە دەبیەخشێت پێشینەیەکی هەبێت بەهەموو ئەو مانایانەوە کە پشتی پێ دەبەستێت، بۆمان هەیە بپرسین لە شێوەی خستنە ڕووی ئەو بیروبۆچوونە دەرچووانەی کە لەبارەی دەسەڵاتەکانەوە خراونەتە ڕوو جا هەر چیەك بن ئەو دەسەڵاتانە، فەلسەفی بن یان کۆمەڵایەتی بن، یان ڕامیاری بن یان ئایینی بن، لەبەر ئەوەی لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا توندترین ئەو بیروبۆچوونانە مەیلیان لەگەڵ ئارەزووبازیدا بووە و زۆرینەشیان شوێنکەوتەی ئەو خەیاڵ پڵاوە نامۆیەن کە دوریان دەخاتەوە لە پلە و پایەکانی دڵنیایی تەواو، پاشان هەر دەبێ خۆشمان لەو بیر و بۆچوونانە دوور خەینەوە کە جەماوەر هوتافیان بۆ دەکێشن، چونکە دەبێ ئەوە بزانین ئەوانە سودمان پێناگەیەنن لە جیاکردنەوەی هەق لە ناهەق و لەو بیروبۆچوونانەدا دەنگەکان حسێب دەکەین بۆ ئەوەی بکەوینە شوێن زۆرترینی ئەو ژمارەیەی کە ئەو بیر و بۆچوونانە لە خۆیانی کۆ دەکەنەوە. کۆبوونەوەی زۆرترین ژمارەی خەڵك بەڵگەی ئەوە نیە تا شانازی پێوە بکرێت بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستیانەی کە دەرخستن و دۆزینەوەیان گرانە، هەروەها گەواهی دانی ئەزمونێکی

هەستاوەری دەخەینە پێش چاو، چونكە فریودان و فێڵە، ئەگەر بگونجێت جارێك فێڵ و فریودا نمان لەگەڵدا بكرێت، ئەوا بەهەمان شێوە دەشگونجێت كە هەمیشە بەبەردەوامی فێڵمان لەگەڵ بكرێت و بمانخەڵەتێنن، مادام لەو بارەدا ڕێكخستنێك نەبێت كە پشتی پێ ببەسترێت.

هەروەها بۆمان هەیە ئەو شێواز و ڕێگایانەی لە ژیربێژی ئەرستۆ دا باو بووە لەسەدەكانی ناوەڕاستدا بخەینە پێش چاو، هەروەها ئەو پێوانە ژیربێژیانەی كە دەسە پێنرێت بەسەر ئەو شتە دا وا داوای لێتوێژینەوەی لە بارەوە دەكرێت، ئەمانەش هیچ شتێك دروست ناكەن زیاد لەوەی دەبنە ڕێگرێك لەبەردەم جوڵەی زیهنی سروشتیدا، چونكە سوڕانەوەكاریە بەسوڕانەوەیەكی ئامێری، دامان دەبڕێت لەبیركردنەوە، یارمەتیمان نادات لەسەر دۆزینەوە و دەرخستنی حەق و ڕاستی.

لەبەر ئەوەی كە ئیتر دوور دەكەوینەوە لە بەهەند وەرگرتنی بیر و ڕای دەسەڵاتەكان و فیكرە بەناوبانگەكان و گەواهیدانەكانی هەستاوەری و ڕێگاكۆنەكانی پێوانەكاری، كەواتە هیچمان بەدەستەوە نامێنێت تەنها شیكردنەوەی ڕێگاكانی دوو زانستە بیركاریەكە نەبێت ئەو دوو زانستەی وا هەموو خەڵكی دانیان ناوە بە پتەوی و بڕیاردانەكانیدا.

هەر دوو ڕێگاكەیان شیدەكەینەوە، نەك بەمەبەستی چەسپاندنیان وەك دووانەیەكی وا لەسەر ئەو مەسەلانەی كە نەگونجێت بۆ ئەم چەسپاندنە، بەڵكو بۆ ئەوەی هەتا ڕزگارمان بێت لێیان گرنگتر لەوەی زیهن دروستی دەكات لە هەموو هەنگاونانە بەرنامە ڕێژی بۆكراوەكانیدا، تا ئاشنایی پەیدا كەین بە تایبەتمەندیەكانی زیهن لە كردەوەكاندا ئەوەش بەهاوتای هەموو ئەو مەرجە گشتییانەی كە سوودی هەیە بۆ هەموو ڕێگەكانی ژمێرەیی و ئەندازەیی،

گەورەترین گومان ئەوەیە کە ئەو کردەوانە زۆر ئاسانن، ژمارەیان کەمە، بەڕای ديكارت هەموو ئەو کردەوە (کرداره) زیهنیانەی (ژیری)یانەی کەبەهۆیانەوە دەتوانین بگەینە زانین و ناسینی شتەکان بەبێ ئەوەی بترسین لە هەڵخلیسکاندن و هەڵەکردن بریتییە لە دوو کردەوە (کردار) ئەو دووانەش: پەی بردن و دۆزینەوەیە.

پەی بردن وەك ئەوەی دیکارت تێبینی دەکات بریتییە لە ڕوانینە عەقلیە ڕاستەوخۆیەی کە زیهن دەرکی پێدەکات لەهەندێ لەو ڕاستییانەی وا دەروون گوێڕایەڵیان دەکات و دڵنیاییان تیا پەیدا دەکات و پێویستی بە پاڵنەرێك نیە. دووبارە پەی بردن ڕوانینێکی عەقلیە لە ڕوون و ئاشکرایی و جیاکردنەوەیەکی تەواوەوە سەرچاوە دەگرێت و هەموو گومان و دوودڵیەکانی لەخۆی داماڵیوە، بەگوێرەی تێگەیشتنی دیکارت ئەمەش بریتییە لەو فەرمانە عەقلیەی کەبوونی نابەسترێتەوە بە هەستاوەری و خەیاڵەوە بەڵکو تاییەتە بە زیهنەوە بەلام زیهنێکی پاڵفتە و پاکژ.

لەو خەونە خەڵەتێنەرانە نیە کە خەیاڵ بڕیاریان بەسەردا دەدات. بەڵکو مەبەستم لەو بیر و بۆچوونە بەهێز و پتەوەیە کە لە زیهنێکی پوخت و بەئاگاوە هەڵدەستێت و تەنیا لە ڕووناکی عەقلیشەوە دەردەچێت.

تێگەیشتنی دیکارتی ئەو فەرمانە عەقلییەیە کە زیهن دەرکی پێدەکات هەر بۆچوونێك بێت لە وێناکردن یان بڕیاردان یان بەلگەڕێژی بەتێگەیشتنیان و تەواوکردنیان لەیەك کاتدا نەك بەشێوەی یەك لەدوای یەك، دیکارت ئەو هاوتەرییەی دۆزیەوە لە نێوان پەی بردن و دۆزینەوەدا کە بۆی دەرکەوت کۆتایی بە تەواوکردنیان نایەت لەیەك کاتدا، بەلام جوڵانەوەیەك لە جوڵانەوەکانی زیهن دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر بەرهەم هێنانی

شتێك لە شتێكیترەوە. هەموو كەسێك دەتوانێت بە پەی بردن ئەوە بزانێت كە بوونێكی پێویستكاری هەیە چونكە بیر دەكاتەوە، سێگۆشە شێوەیەكی دیاریكراو، بەوەی كە سێ لای هەیە، ڕاستیەكانیتر زۆرن تا بیانزانین چونكە زانینمان لە بارەیانەوە شاراوەیە، لەبەر ئەوەی بەهۆی ئاسانیانەوە ئاگایی خۆمانی پێوە پەیوەست ناكەین، ئەو ڕاستییانەی لەم ڕووەوە دەتوانین پێیان بگەین بەهۆی ئەو چاكیەوەیە كە پێویستیان بە سەلماندنی خودی كەس نیە، لەبەر ئەوە دیكارت بڕیاری ڕەهای دا لەسەر: ڕووداو ( كارەسات )، ڕووناكی فیتری ( خوایی )، غەریزەی عەقلی، كە بەهۆیانەوە زانیاری پێویست و تەواو بەدەست دەهێنن بۆ سەلماندن و جێگیركردنی زۆر بابەت و مەسەلە.

دیكارت لەو بڕوایە دابوو كە پەی بردن هیچ كەم ناكاتەوە لەسەر ماناكان و بیروبۆچوونەكان، بەڵكو ئەو ڕاستیانەمان بۆ بەدەست دێنێت كە گومان هەڵناگرن، وەك چۆن سروشتە سادەكانمان بۆ بەدەست دێنێت ئەوەش: ( تەنها تاییەتمەندیە سروشتیەكان )ە كە لە بەر ئاسانیان بە زیهن دەركیان پێ دەكرێت دەركردنێكی ڕاستەوخۆ و دەشگونجێت هەموو سروشتەكانیتری لێ ڕزگار بكرێت: نموونەی ئەمەش وەك: بوون و یەكێتی و درێژبووونەوە و جوڵە و شێوە و كات و شوێن، هەروەها كردارەكانی زانین ( مەعریفە ) و گومان و ئیرادە ( توانایی ). سروشتە سادەكان ئەو سروشتانەن كە گەیشتن بەئاستی زانینیان لە ڕوونی و جیاكردنەوەدا بەو ئاستەیە كە بەرهەڵستی زیهن دەكات لەدابەشكردنیان بۆ شتیتر و گەورەترین جیاكردنەوەیان تێدایە. هەستكردنمان بەسروشتە سادەكان بێبەریە لە هەڵە، لەبەر ئەوەی بیر و بۆچوون هەمیشە لەخودی خۆی دا ڕاستە، چونكە هەڵە لە كرادرێكی وادا جێی

نابێتەوە کە زیهنی تێدا ببینرێت، بەڵکو لەو کردارەدا جێی دەبێتەوە کە بڕیاردانی تێدایە.( ٢٧ )

بڕیار ( حوکم ) لای دیکارت ناگەڕێتەوە تەنها بۆ عەقڵ، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ "ئیرادە" و "بڕیاری ئازاد"یش، لە پێناوی ئەمەشدا هەڵەیە گەر بیدەیتە پاڵ مرۆڤێکی وەهاوە کەبتوانێت ئازادیەکەی بەکار بێنێت بەبەکارهێنانێکی خراپ، وەك ئەوەی بەکاری بێنێت لە نێوان فیکرەکاندا ( بیرو بۆچوون )ەکاندا کە هیچ پەیوەندییەکی نەبێت بە حەقیقەت و واقیعەوە.( ٢٨ )

هۆکاری دووەم بۆ گەیشتنە دڵنایی بیرکاری بریتییە لە دۆزینەوە، ئەویش ئەو هێزەیە کە بەهۆیەوە راستیەك لە ڕاستیەکان تێدەگەین کە بەرهەمی ڕاستیەکیترە لەم ئاسانترە. ئەوەش بۆ خۆی کردارێکی زیهنیە و بەهۆیەوە ڕزگارمان دەبێت لەو شتەی کە زانینێکی دڵنیاکەرمان لەبارەیەوە هەیە و بەرهەمی وابەستەبوو نمانە پێوەی، یان چالاکیەکە دەگوازرێتەوە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر، وە لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکیتری دوای خۆی یان بۆ ئەو شتەی وابەستەبوون لەبارەیەوە راستەوخۆ و پێویستە، پاشان لە دووەمەوە بۆ سێهەم و هەتا دوایی.

دۆزینەوە بە پێی چەمکی دیکارت جیاوازە لەو پێوانەیەی لە ژێربێژی ئەرستۆ و ژێربێژی ( مەنتیق )ی سەدەکانی ناوەڕاستدا دەکرا. لەبەر ئەوەی پێوانەکاری کۆن پێکەوە بەستنە لە نێوان بیر و بۆچوونەکاندا ( ئەفکارەکاندا ). بەڵام دۆزینەوە پێکەوەبەستنە لەنێوان ڕاستیەکاندا. پاشان پەیوەندیە سێسنووردارەکە لە پێوانەدا مل کەچە بۆ بنەمایەکی ئاڵۆز و بەرێگایەکی ئامێرکاری ( ئالی ) جێبەجێ دەکرێت بۆ زانینی پێوانەی بەرهەم هاتوو ( بەدەست هێنراو ) و بەرهەم نەهاتوو ( بەدەست نەهێنراو )، لەکاتێکدا

بڕیاردان بەهۆی پەی بردنەوە دەزانرێت، زانین ئەوەیە کەلە دڵنیاییەوە دێت و بەجۆرێك کە کەمترین بیرچوونەوە پێویستی بە بەڵگەکاریە و ناگونجێت بەخراپی جێبەجێ بکرێت. پێوانە جیا دەکرێتەوە بەهۆی پەیوەندیە نەگۆڕەکانەوە جا هەستی پێبکرێت یان هەستی پێنەکرێت، بەلام بزووتنەوەیەکی ( جوڵەیەکی ) فیکری پێگەیشتووە، بزووتنەوەی فیکر شتەکان دەبینێت یەك لەدوای یەك بە بینینێکی دڵنیایی. بەلام لای دیکارت شوێنێك نیە بۆ دۆزینەوە تەنها بۆ مەسەلە دڵنیاییەکان ( یەقینەکان ) نەبێت، لەم کاتەشدا چاومان دەکەوێت بە پێوانەکاریەکانی ( أرسطاطالي ) کە ڕێگە خۆش دەکات یان ( ماوە فراوان دەکات ) بۆ مەسەلە ئیحتیمالیە نیشتمانیەکان هەر وەك لە پێوانەکاریە وتووێژیەکان ( جەدەلیەکان ) و وتاربێژیەکان دا دەیکات.

ئەوەی دۆزینەوە پێی هەڵدەستێت ڕۆڵێکی گرنگی بۆ نامێنێتەوە بە پێی بەرنامەی دیکارت کە متمانەی زیاتری هەبێت لە پەی بردن، لەبەر ئەوە هەر دەبێت لەخاڵێکەوە لەسەر ئەوەی کە دۆزینەوە کەمتر ( بەهێز و پتەوترە ) لە پەی بردن، پشت بەستن بەوەی کە هەموو دۆزینەوەیەك پێویستی بەکات هەیە، ئەمەش بەو لە جیاتی دانانە پێویستی دەبێت بە بەکارهێنانی ئەو بیرەوەری ( زاکیرە )یەی کە ناپاکی و خیانەت لە مرۆڤ دەکات لەهەندێ جار دا.

دڵنیایی پەی بردن پێش هەموو شتێك هاتووە بەوەی لە ئاوەز دایە و هەر ئەویشە هاوبەشی دەکات بۆ دۆزینەوە، بەلام تایبەتمەندە بەوەی کە ڕوو دەکاتە شتێك لە وێناکردنماندا بۆی چەسپیوە لە ئاسانی و جیاکردنەوەدا بە جۆرێك ڕێگری دەکات لە سەر هەر زیهنێك ( ژیریەك ) کە وادەگونجێت پێویستمان پێی هەبێت بۆ زانینی، ڕێگری ئەوەشی لێدەکات کە بەخراپی جێبەجێی کات و پێی هەڵسێت.

**ئەم دوو كرداره بیركاریـە ( پـەی بـردن و دۆزینـەوه ) دەگەڕێنـەوه بـۆ یـەك كردار( فعل )، پشت بەستن بەوەی كه دۆزینەوه زنجیرەیەك پەی بردنـە. هـەموو زیهنێك ( ژیریەك ) توانای هەیه بەم دووانه هەڵسێت به فیترەت بەبێفێربوون، هەر دووكیان عەقڵی ڕاشكاو و خودی خۆیـەتی وه هـەر ئـەو عەقڵەیـە شتەكان ڕاست دەكاتەوه كه لەنێوان خەڵكیدا دابەشكراوون.**

## بنەماكانی بەرنامەی دیكارت:

**دیكارت لەم كتێبەیدا "*بنەماكانی ڕێنمـایی عـەقڵ*" باسـی بیسـت و یـەك بنەمای كردووه. بەڵام بەداخەوه مرد و مەرگ مـەودای نـەدا ئـەم كتێبـە تـەواو بكات، ئـەم كتێبـە دادەنرێت بـەقووڵترین و بـەنرخترین نامـەی ژیربێـژی كـه فەلسەفەی پێناشنا بووه لەهەموو قۆناغەكانیدا، بەڵام دیكارت ئـەو كاتـەی كتێبی "*وتـارێك دەربارەی میتۆد*"ی نووسی چەند ژمارەیەكی زۆری لەبنـەماكان لەم بارەیەوه ڕاستكردەوه، ئەوەی بۆ دەركەوت ـــ هـەر وەك دەردەكـەوێت ـــ كـه زانستی ژیربێژی كۆن لەكاتێكدا بەزرِی و بێبەر مابوویەوه لەبارەی لێكۆڵینەوه و بەدەست هێنانەكانیەوه لـه بـەر زۆری ئـەو بنەمایانـەی كـه دەیگرتـە خـۆی، كەچـی سـەركردەكانی دەوڵـەت لـه توانایانـدا بـوو كـه فـەرمانڕەوایی بكـەن بەژمارەیەكی كەم له یاسـاكان مـادام سـوور بـوون لەسـەر چـاودێریكردنی ئـەو فەرمانڕەواییه بەچاودێریكردنێكی ورد، له بەر ئەوه دیكارت لەكورتی بڕیـەوه و تەنها هاته سەر باسكردنی چوار لەو بنـەما سـادانه لـه "*وتـارێك دەربـارەی میتۆد*"ەوه، یەكەمیان بەستراوه بە پەی بردنەوه و سیانەكەی تـریش بەسـتراوه بەدۆزینەوەوه. ئامانج لەم چوار بنەمایەش ئەوەیه كه وەسفی ئەو ڕێژەیه بكات**

کە زیهن ئیشی لەسەر دەکات کاتێك کە بیر دەکاتەوە بەبیرکردنەوەیەکی بیرکاریانە. بریتین لە:

١- دان بەهیچ شتێك دانانێم هەرگیز لەسەر ئەوەی ئەو شتە ڕاستە تا بەڕوون و ئاشکرایی بەشێوەیەکی بەڵگەنەویست نەزانم ئەو شتە وایە، ئەمەش بەو مانایە دێت کە هەموو هەوڵێك بخرێتە کار بۆ دوورکەوتنەوە لە پەلەکردن و خۆ نەبەستنەوە بە بڕیارەکانی پێشوەوە، لە بڕیارەکانمدا دانی پیا نانێم تا کاتێك عەقڵم ڕێنموونیم نەکات لە "ئاشکرایی" و "جیاکردنەوە" دا بە نەهێشتنی هەموو گومانێك بەو دووانەوە.

٢- هەر یەکێك لەو گرفتانەی دەمەوێت توێژینەوەی لەسەر بکەم، بەوەندەی بتوانم و بۆم بکرێ دابەش دەکەم بۆ بەشەخێردارەکان، بەڕێژەی ئەو داواکردنەی کە پێویستە بۆ حەلکردنی لەسەر باشترین شێوە.

٣- بیر و بۆچوونەکانم ڕێك دەخەم، دەست پێ دەکەم بەئاسانترین حاڵەت و سوکترین زانیاری، پلە بە پلە سەر دەکەوم هەتا دەگەمە زانینێك (مەعریفە)یەك کە لەهەموویان ئاڵۆزتر بێت، بەڵکو ڕێکخستنێکی وا دەسە پێنم لەنێوان حاڵەتەکاندا بەجۆرێك هەندێکیان پێش نەکەون لەهەندێکیتریان.

٤- لەهەموو حاڵەتەکاندا کار بۆ ئەوە دەکەم ئامارە تەواوەکان و پیاچوونەوە سوودمەندەکان بمگەیەننە سەر سیقەیەکی وا بەجۆرێك کە بڵێم من لەهیچ شتێك بێئاگا نیم کە پەیوەندی بەکێشەی پێشاندراوەوە هەبێت بۆ لێتوێژینەوە.

مەبەست لەبەرنامەی دیکارتی ڕێنمایی کردنی عەقڵی ڕێك و ڕاستە. ئەو دەستوورەشی دیکارت قسەی پێدەکات و بەدەقیکی داڕێژراو پێمان دەڵێت لەسەر

ئەوەی كەشتەكان قبولْ نەكەین تەنها ( بەڵگەنەویستەكان ) نەبێت، وە لەسەر ئەوەش كە هەمیشە دەست پێبكەین بەئاسانەكان و ڕوون و ئاشكراكان، وە لەسەر ئەوەش كە لەتوێژینەوەكا نماندا شوێنكەوتەی ڕێكخستن و یاسایەكی نەگۆڕ بێت، ئەمەش لە واقیع و ڕاستیدا بنەماكانی زیهنێكی ڕێك و ڕاستە، وە هەموو زیهنێكی ڕێك و ڕاست كت و مت زیهنێكی دیكارتیە.

## دیكارت و ئەودیوی زانست:

لەزانادا دیاردە سروشتیەكان هەیە یەكێتی زاڵە بەسەر گۆڕانەكانی دیاردەكان و جۆرەكانیدا، یەكێتی عەقڵی زانستی دەسە پێنێت بەمەبەستی زانیاری زانا، یەكێتی زانست و مەعریفە و بەرنامەیە، جەوهەر یان بوون یەكێتی نیە، ڕوانینی زانست بۆ دیاردە سروشتیەكان قوڵترین ڕوانینەكانە لەبارەی جەوهەر و بوونەوە. بەڵام لێرەدا چەند حاڵەتێك هەیە كە عەقڵی زانستی بڕیاری لەسەر دەدات ئەمەش بۆ سەركردایەتیكردن تێیدا. لەو دیاردانەش ـ ڕاستیە ـ كە ئەویش جەوهەر یان بوونی تێدا نیە...

لەسرووشتدا ( حەقیقەتێكی ) ڕاستیەكی بیركاریە كە زانا دەیزانێت تەنها بە چاوی زەین و بەڵگەكاری، حەقیقەت دروستكراوێكی كارایە بۆ ئاستێكی دوور، بەلام بیر و باوەڕەكان لە دەروونـدا نەگۆڕ و چەسپاوە، توخمەكانی سەنگینیەكیان تێدایە وەستاون لە بەردەم بینینێكی زیرەك و بێخەوشدا. جا دەسەلات و زاڵبوونەكانیشی لەسەر دیاردەكان هەر چۆنێك بن، بەرامبەر ئەو یاسا و بیر و باوەڕ و سەنگینیانە ( گرنگیانە )، ئەوا عەقڵە سەیركەر و تۆماركراوەكان تەنها بڕیار لێدراون، لەسەر بنەمای ئەم سەیركردنە ( تێڕوانین )ەوە زانستێكی ڕاست و دروست و كارێكی سەركەوتوو بنیات دەنێین.

دووبارە بۆ سرووشتیش حەقیقەتێکی بیرکاری هەیە، عەقڵی مرۆڤایەتی مل کەچیەتی و ڕێ دەکا لەسەر ڕاسپاردەکانی لە زانست ۆ کارەکەیدا، کێشەیەك هەیە لەبیر و بۆچوونەکانی ژیربێژی و بیرکاری و یاسا نەگۆڕەکانی جوڵە و سەنگیینیەکان (بەهادارەکان) و سروشتە جێگیرەکاندا بەوەی کە ئەو بیروبۆچوون ویاسایانە ئیشی تێدا دەکەن ئەویش ئەو حەقیقەتەیە کە مرۆڤ بەهۆی بینینەوە دەرکی پێ دەکات، وە ئەمەش بەعەقڵ و بەڵگەکاری دروست نەکردووە، وە ناشتوانێت گۆڕانکاریان لە بری دانانیشی تێدا بکات، چونکە حەقیقەتێکی جێگیر و هەمیشەییە.

ئەو حەقیقەتەی کە مرۆڤ دەتوانێت داهێنانی تێدا بکات بریتیە لە حەقیقەتێکی ڕەها؟ ئایا ئەمە یەکەمین حەقیقەتە کە هەموو عەقڵێك مل کەچی بێت؟ وە ئایا هەڵوێستی هەموو عەقڵێك لەبەرامبەریدا وەك هەڵوێستی سەیرکەرێکی تۆمارکراو دەبێت؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە هاوڕێکەی دیکارت (مرسین) خستیە پێش چاو لەساڵی ١٦٢٠ دا بە پێی ڕایەك کە لە کتێبێك لەکتێبەکاندا خوێندبوویەوە، ئەم ڕایە ڕێبەرایەتی ئەوە دەکات کە خواوەند مل کەچە بۆ پێویستیەکی ڕەها، بۆ پێویستیەکی حەقیقەتە بیرکاری و ژیربێژیەکان.

دیکارت وەڵامی ئەم پرسیارەی (مرسین)ی دایەوە لەو سێ نامەیەیدا کە دائەنرێن بەگرنگترین نامە فەلسەفیەکانی و یەك بەدوای یەکدا نووسینی لە ١٠ی ئەپریل و لە ٦ی مایۆ و ٢٧ی مایۆی ساڵی ١٦٣٠ دا وبڕیاری ئەوەی دابوو تێیدا کە عەقڵی ئیلاهی (خواوەند) مل کەچ نابێت بۆ ئەم حەقیقەتانە، هەر وەك دەبینرێت ئەو حەقیقەتانە شتێك نین لە دەرەوەی بابەتەکانی ئەو دا بن و سەپێنراو بن بەسەریدا، لەگەڵ ئەمەشدا بەشێك نین لەو، چونکە (هەموو)ـ

لەبەشەکانی پێکهاتووە ـ هیچ جیاوازیەك نیە لە پلەکاریدا لەنێوان ( هەموو ) و ( بەشەکان ) دا، بەڵکو هەناردەشی ناکات و لێشیەوە دەرناچێت، هەروەك ( ڤلۆتین ) دەیبینێت، وەك دەرچوونی تیشك لەخۆر. چونکە ئەو تیشکە دەرچووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەبێ ئەوەی ئەو دەرچوونە لە لایەن تیشکەکە خۆیەوە بێت، بەڵکو لە پێویستیدا دەرچووە، بەبێ ئەوەی سەرکێشی بکات لەوەی بەسەری پێویست کراوە لەدەرچوون و پەخشانکردنی خۆی. ئەوەش بەستراوە بەو پێویستیەوە کە لێوەی دەردەچێت، هەروەك چۆن ئەمەی دواییان پەیوەست بوونی هەیە بەخواوە. ئەوەش نابێتە رێگری وێناکردن لەخوادا، ئەو خوایەی کە مل بۆ هیچ شتێك کەچ ناکات و پەیوەستیش نیە بەهیچ شتێکەوە و هەموو شتەکانیش ملە کەچی ئەون، خوای دیکارت، وەك خواوەندی یۆنان نیە، وەکو ئەو مل کەچ ناکات بۆ قەزا و قەدەر بەڵکو خواکەی ئەم هەموو قەزا و قەدەرەکان ملە کەچن بۆی، هەروەها قەزا و قەدەریش ناگرێتە خۆی لەشێوەی حەقیقەتەکان یان پێویستیەکان، ئەمەیان ڕاستە بۆ قەزا و قەدەر کە پشتی پێ دەبەسترێت و بوونی هەیە.

چۆن مل کەچی بۆ خوا دەکەن ئەو حەقیقەت و یاسایانەی کە زانست بڕیاری لێداون؟ ئێمە تەنها یەك مانای مل کەچ بوون دەزانین، هیچی‌تر جگە لەمە نازانین ئەویش، مل کەچ بوونی دروستکراوەکانە بۆ دروستکەر ( خالق )، هەر خوایە ئەو حەقیقەتانەی خوڵقاندووە و دروستی کردوون هەروەك چۆن ئێمەی خوڵقاندووە و دروستی کردووین. بوون و ویست و تێگەیشتنی خوا ئەزەلیە ( لەئەزەلەوەیە ) هەر هەبووە و هەر دەشبێت. هەندێ لەو بانگەشانە ڕاست نین وا دەڵێن: عەقڵ لە خوا دا پێش ئیرادە ( ویست ) کەوتوە، هیچ پاش و پێش کەوتنێکی کات یان ژێربێژی ( منطق )ی لەخوا دانیە. بەڵکو ویستی خوا

بۆ زانین و تێگەیشتن لەهەمان چرکەساتدایە و بەهەمان مانایە، وە لە ( یەکتاییەکی کامڵ و ڕەهادا )یە. ئەم مانایەش لەسەرووی تێگەیشتنی ئێمەوەیە. خواوەند لەسەرووی ئاستی تێگەیشتنی ئێمەی دروستکراوەوەیە. ئەمەش لەبەر ئەوەی خۆی تواناداری و بەدەسەڵاتە و ئیرادەی هەیە، هەروەها هیچ سنوورێك و پێوانەیەك نیە بۆ هێز و توانا و دەسەڵاتی ئەو، هەروەك چۆن هیچ شتێك ناتوانێت ڕاڤەی ئازادی و سەربەخۆیی ئەو بکات و بەتەواوی ماناکانی لێکبداتەوە.

چونکە ئەو بەتوانا و دەسەڵاتدارە بەوەی کە لەهیچ و نەبوونەوە جیهانی خوڵقاندووە. بەمانە دا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوقسە و گوفتارانە ناڕەوان و ڕاستییان تێدا نیە، لەبەر ئەوەی ئێمە لەنهێنیەکانی خوا تێناگەین، هەروەها لەبەر ئەوەی ئێمە تێناگەین لەو هێزە خواییەی ( ئیلاهیە )ی کە لەخودی خوادایە و ئەوەش سیفەتی خوای پەروەردەگار و باڵادەستە.

لێرەدا پەیوەندیەکی ڕوون و ئاشکرا هەیە لەنێوان مل کەچ بوونی حەقیقەتە هەمیشەییەکان بۆ خواوەند و هێز و توانا و دەسەڵاتی. لەتوانامانداییە تێیان بگەین و بیانزانین. ئەو حەقیقەتانەش بەزۆری ناو نانرێت ( ناوزەد ناکرێت ) لەسەر ئاستی مرۆڤایەتی و تەنانەت مرۆڤ توانای تێگەیشتن و ناسینیانی نیە. لەئاست و توانای مرۆڤدا تێگەیشتن و زانیاری لەبارەیانەوە نیە، چونکە خوڵقێنراوێکی وەکو خۆی وان، تەنها مل کەچن بۆ هێز و توانا و دەسەڵاتی خوای تاك و تەنها.

ئەمە ڕا و بۆچوونی دیکارت بوو لەسەر ئەو پرسیارەی کە هاوڕێکەی ( مرسین ) ئاڕاستەی دیکارتی کردبوو. ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم پرسیارە دا ئەوەیە کە ئەمە موفاجەئەیەك ( کوت و پڕیەك ) بوو بۆ دیکارت چونکە

پرسیارەكە لە بارەی بابەتێكی فەلسەفی ئاڵۆزدەویە، چونكە دیكارت تا ئەو كاتەش فەلسەفەكەی خۆی ئاشكرا نەكردبوو، وە لەوانەیە هەر دەستیشی نەكردبێت (بەفەلسەفەكەی). بەلام وەلام دانەوەی دیكارت لەسەر پرسیارەكە ئەوەش بۆ خۆی دوبارە موفاجەئەیەك بوو بۆ هاوڕێكەی (مرسین) بەوەی كە لەناوەڕۆكی ئەو وەلامەدا هەلوێستە ترسناكەكانی لەخۆ گرتبوو، لەبەرئەوەی دیكارت ئەلێ پرسیاری ئەو بابەتەی كە لێی كراوە بەلایەوە سەیر نیە چونكە پەیوەندی هەیە (لەڕوانگەی ئەوەوە) بەو مەسەلە فەلسەفیە سەرەكیانەوە كە ئەو ئیشی تێدا دەكات و سەرقاڵیەتی، بە پێی ڕەئی خۆی چەند مانگێكی تەواو كاری تێدا كردووە، كە دەگونجێ بیر و باوەڕی خۆی تێدا دەرخستبێت بەلام لەبارەی دەربڕینی ئەو بیر و باوەڕەوە دەربڕینێكی كۆتایی نەبووە.

بەشێوەیەكی گشتی بیر و باوەڕی كە فەلسەفە پێش هەموو شتێك پشت دەبەستێت بە "ناسینی مرۆڤ بۆ خودی خۆیی و خواكەی خۆی"، هەستێ بە ئیسپاتكردنی هەبوونی خوا. بۆیە دیكارت شانازی بەوەوە دەكرد كە گەیشتووە بە سەلماندنێك لەسەر ئەو بوون (وجود)ە و لیكی دەچواند لە وردەكاریەكانیدا بە بەلگەیەكی ئەندازەیی.

گەر سەرنج بدەین لەبارەی ئەو زانینەی وا بیر و بۆچوونی دیكارت هەیەتی لەسروشتی حەقیقەتە زانستیەكان و ڕەسەنایەتیان و خوڵقاندنیان لە لایەن خواوە، فەلسەفەكەی دیكارت لە گومانەوە دەست پێدەكات. نەك بە پێی هەبوونی گومان لە هێز و توانا هەستاوەریەكان و عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤ، بەڵكو گومان لەزانست و دڵنیایی تێیدا، هەروەها لەبابەتەكانی زانست و حەقیقەتەكانی لەوەی كە (چی بن و ڕێكخستنیان چۆن بێت لەیەقینەدا). لە لایەكیترەوە، ئەم بیردۆزە (تیۆریە) زانست و بابەتەكانی و حەقیقەتەكانی

بەو شێوەیە دادەنێت (ئیعتیبار دەکات) هەر وەك چۆن لەهەڵس و کەوتەکانی مرۆڤدا هەیە، چونکە ئەوانیش درۆستکراوێکن لە نموونەی خۆی، لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت بەکاریان بێنێت لە پێشخستنی زانستەکانیدا و لە پەرەپێدانی دروستکراوەکانیدا، ئەو بیردۆزەش (تیۆریەش) مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ پێداچوونەوەی دەروونی خۆی، هەروەها دەیگەڕێنێتەوە بۆ زانینی پلە و پایەی خۆی لە بووندا، لەنێوان خواوەندی خاوەن هێز و باڵادەست و لەنێوان بابەتەکانی زانست و حەقیقەتەکانیان. هەر کاتێك مرۆڤ پێگە و ناوەندی خۆی زانی و دۆزیەوە کە ئەمەیە ئەوا دەتوانێت ببێتە فەیلەسوف: فەلسەفەش وەك دیکارت دەیبینێت هیچی‌تر نیە جگە لەناسین و زانین و زانیاری مرۆڤ نەبێت بۆ خودی خۆی و خواوەند.(٢٩)

## دیکارت لەگومانەوە بۆ دڵنیایی:

فەیلەسوفان و زانایان تێکۆشاون لەسەر هەڵگیرساندنی ئاگری جیاوازیەکان لەبیروبۆچون و ڕاگۆڕینەوەیان لەگەڵ پیاوانی ئایینی و بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونە ئایینیەکانیان لەکاروبارە عەقڵانیە گەورەکاندا، ئەمەش لەو سەردەمەی کەدیکارتی تێدا دەژیا، کە بەشێوەیەکی کردەیی ئەمە دەرکەوت لە دابڕانی ئەوانەی وا ویستیان چارەسەر و شیکردنەوەکان پێش کەش کەن لەوەی وا بەعەقڵ و ئاوەز دەکرێت و جێبەجێ دەبێت و دەبێتە هۆی دڵنیایی ئەو دەروونانەی وا خۆپارێزیان کردووە لەشۆڕبوونەوە بۆ ناو قوڵاییەکانی ئەو حەقیقەتە کارایەی (چالاکەی) لەبوون و دروستکراوەکاندا هەیە.

ئەگەر هات و ( حەکیمێك ) ژیر و دانایەك هەستا بە ڕەتکردنەوەی ئەو حەقەی وا بنیات نراوە بێکەم و کوڕی و جیاوازی یان کەوتنە پشکنین لەبارەی ئەو ( یەقین )ە دڵنیاییەی کەدەتوانێت پێی هەڵسێت لەڕاگەیاندنی ڕاشکاوانەی زانست. ئەوا بڕیار دەدات لەسەر ڕەتکردنەوەی هەموو بیر و باوەڕە باوەکان و چاو دەپۆشێ لەڕابردوو، هەروەها گومانی دەبێت لەهەموو ئەو شتانەی کە پێشتر فێریان بووە. وە لەمەشدا تا ئەوپەڕی سنوور تێی دەپەڕێنێت و دوور دەکەوێتەوە، تا دەگاتە ئاستی بڕیاردان و کوڵنەدان و لەسەر ئەوەی دووبارە سەر لەنوێ هەموو ( ڕوانین و بۆچوونەکانی ) دەست پێبکاتەوە یان چاو بخشێنێتەوە بەهەموو شتەکاندا، لەوانەیە چەند بنەمایەکیتری دڵنیاکەر بدۆزێتەوە بۆچاکسازی ڕیشەیی لەهەموو زانینە ( مەعریفە ) گونجاوەکاندا.

سەرنج ئەدەین کە دیکارت "*ڕامانەکان*" و لە "*بنەماکان*" دا توێژینەوە ناکات لەبارەی ئەو بابەتانەوە کە لەدەرەوەی دەروونـدان و شوێنەوارێکی دووریان هەیە لێوەی، هەروەها لێکۆڵینەوە ناکات لەبارەی ئەو میهرەبانیە چاکسازیەی بۆ بنیات نانی زانست و گەشە پێدانی "یەکەمین بیر و بۆچوون"ەی تێیدا دڵنیایی تیۆریی ڕەها بەدی دەکرا، دڵناییەکی پاك و بێگەردی دوور لە هەڵە. ئەم توێژینەوەیە لەڕوانگە و بۆچوونی دیکارتەوە گرنگی دەدا بەو گومانەی کە لەهەر شتێکدا ڕێی تێدەچوو گومانی لێبکرێت یان لە هەر یەك لەو شتانەی کە چێژوەرگرتنی تەواوی تیا بەدی نەدەکرا لەدڵنیایی زیاتر و ڕەها. وە "گومان" یەکەمین هەنگاوە لە تێڕامانی فەلسەفیدا و هەنگاوێکی چالاك و کاریگەر و بنەڕەتیشە. خودی گومان خۆی تێڕامانێکی ڕاوەستاوە لەکاتدا و پێویستی بەقۆناغەکانی ڕێکخستنە لەئاسانەوە بۆ قورس و زەحمەت، کە لەکۆتاییەکەیدا دەبێتە هۆی ئەنجامێك لەوانەیە بەخرا پی

( سلبی ) بەڕوویدا بوەستینەوە، وە دەشگونجێت باش و ئیجابی بێت و ڕێگایەك لەبەر دەممماندا بکاتەوە بۆ دڵنیایی فەلسەفی کامڵ و تەواو.( ۳۰ )

گومان هەنگاوێکی پێویستیە هەر دەبێت وەربگیرێت: بەهەڵە هەواڵم زانی و ڕووبەڕووی بوومەوە هەر لەسەردەمانێکی زووەوە و ئیحتیمالی نوێبوونەوەی هەیە بە کردەوە کە مل کەچیم نواندووە و بڕیارانە بۆ ئەو ڕاستێتیشم تێدا نەدەبینین، جا ئەو بڕیارانە بەسەر سەرما سە پێنرابوون لە لایەن ماموستایانەوە یان ڕابەرانەوە یان لەوەکیلەکانیانەوە وەك ئەو بڕیارانە بێت کە سە پێنرابوون بەسەرما لەلایەن هەست و خەیاڵەوە یا نا ـ دووچاریان بوو بووم بۆ هەڵەیەکی ناسراو ـ هەموو ئەمانە کێشیان دەکردم بۆ گومان.

دیکارت دەیبینی کە گومان پەیوەست بووە لەهەموو سەرچاوەکانی ئەو بڕیارانەدا، ئەوەی مابوویەوە لە دەروونمدا( ۳۱ ) لەو زانستەی لەڕابردوودا وەرم گرتبوو، لەهەموو ئەو ڕابردووەدا، لەهەست و خەیاڵ، هەر چۆنێك بوو بن فێر کردنەکانیان. لەوانەیە ئەم شتانەم چەند جارێك هەڵیان خەڵەتاندبم، ئەبێ چی بێ بەرهەڵستی لەو هەڵخەڵەتاندن و فریودانەم بکات هەمیشە؟ دووبارە پێویستە لەسەرم نەخشەی گومان وەرگرم. ئایا مانای نەخشەی گومان بەتەواوی چیە؟ مانای دوودڵی ناگەیەنێت لە قبوڵ کردنی بڕیارێك لە بڕیارەکان ( فەرمانێك لە فەرمانەکان ) یان مانای لاسەنگ بوون نیە لەنێوان قبوڵکردن و ڕەتکردنەوە دا و بەردەوام بوون لەم دوودڵی و لاسەنگیەدا. هەروەها بە تەنها مانای ئەوە ناگەیەنێت سە پاندنی بڕیارێك لەبڕیارەکان بێت یان وێناکردن و دەرباز بوون بێت لێی بەوەی کە ئەو بڕیارە قسەیەکی ڕاستە.

بەڵکو مانای دوودڵ ( ڕاڕا )نەبوون یان تواناداری لەسەر ئیعتبار دانەنان بۆ ئەو بڕیار و فەرمانانە و گرنگی پێنەدانیان دەگەیەنێت بەوەی کە لەناو ڕێکخستن و شوێنی ڕیزبەندی ڕاست یان هەڵەدا حسابی بۆ دەکرێت. هەر گرنگی پێدانێك لەم بارەیەوە، هەر ڕێزێك بۆ پلەداری بڕیارەکان لە ڕاست و درۆ، یاریکردنە بە ئاگر و تووشبوونی بەو بڕیارو فەرمانە ناوبراوانەی باسمان کردن، جا ئیتر ئەو بڕیارانە لەو زانین و فێربوونە ڕابردووەوە دەرچووبێت کەڕاستێتیان تیا نەبینراوە و ئاشکرا نەبووە یان لەهەست و خەیاڵەوە دەرچووبێت.

پشتگیری کردنی سەلامەتی نەخشەکەمان کت و پڕ لەوخەونانەدا دەبینین کە لەکاتی خەوتندا بەدی دەکەین. چونکە لەکاتی ئەو خەو بینینەماندا شتی وامان پیشان دەدرێت کە هیچیان کەم نین لەو هێز و زیندووییەی لەبابەتەکاندا هەیە لەکاتی بەئاگاییماندا، بەڕادەیەکی واتا ئەو ئاستەی نەتوانین جیاوازییەکی بنەبڕ و سەلمێنەر بەدی بکەین لەنێوان حاڵەتەکانی خەو و بەئاگاییدا.( ٣٢ ) ئەگەر بێت و بارودۆخەکە بەم جۆرە بێت ئەوا چی دەزانین لەبارەی ئەوەی کە وا ئەم جیهانە هەستپێکراوەی ئێمەی تێدا دەژین کێ ناڵێت شوێنەوارێك بێت لە شوێنەوارە بەجێماوەکانی کارلێکردنی خەیاڵە خەڵەتێنەرەکان، شوێنەوارێکی وا بەهێز و جێگیرکراو بێت کە زادەی هەموو خەونەکانی ناو خەوتن بێت؟

هیچ پەند و تەعبیرێکی تیا بەدی ناکرێت ئەم دەستەواژەیە بووترێت، لەیەکێك لە ڕووەکانی ژیانی کردەییەوە پشگیری ڕووداوەکانی بەئاگایی بکرێت و ئینکاری خەونەکانی ڕووناکی بکرێت. تەنها ئەوە نیە کە لەگۆڕەپانی

**دڵنیایی تیۆریی فەلسەفیەوە پەنا بەرینە بەر پێوانەکاریەکانی ژیانی کردەیی.**

**بەڵام مرۆڤ کائینێکی بەهەست و ئەندێشە و بیراوەری پارێزێکی بەو جۆرە نیە بە پێی پێویست، هەروەها کائینێکی قسەکەرە و پشت دەبەستێت بەعەقڵی خۆی، لە وێناکردن و بینین و بەڵگەرێژیدا. یەکێك لەو شتانەی کە ڕێکەوتوون لەسەری و بڕوای پێدەکرێت ئەوەیە کە دەڵێت: بەلانی کەمەوە تەنها یەك زانست هەیە کە ئەو پشت پێبەستنەی تێدا بەدی دەکرێت وا گرنتی مرۆڤ دەکات لەهەڵەدا، ئەوەش زانستی بیرکاریە. بەڵام تاقیکردنەوە پشتگیری ئەم ڕێکەوتنە ناکات بە پشتگیریکردنێکی تەواو. بۆ چەند جارێك هەڵەمان کردوە بەڵکو بەناوبانگ ترین بیرکاری زانانیش هەڵەیان کردووە لەسەلماندنەکانی ئەم زانستەدا؟ وە ڕوودانی ئەمەش چەند جاریك کێ دەڵێ و کێ ئەزانێ کە هەموو جارێك و بەهەمیشەیی ئەم هەڵانە ڕوو نادەن؟ ئایا دووبارە حیکمەت لەوە دا نیە کە نەخشەی گومان وەرگرین لەبەرانبەر خودی بڕیارو فەرمانە بیرکاریەکاندا، بڕیاری ئەوەش بدەین کە ئیلتزامیان پێوە نەکەین؟( ٣٣ )**

**بەڵام ئەوە دەردەکەوێت لەم هەڵوێستە دا زیادە ڕۆیی تیا کرابێت و بارقورسیەکی تێدا بێت بۆ دوورخستنەوەی و قبوڵ نەکردنیان لەلایەن عەقڵی کارامەوە، ئەگەر هاتوو و تەنانەت واشمان دا بەدەستەوە کە بابەتەکانی جیهانی هەستپێکراو دانراوێك ( نووسراوێك ) بێت و خەیاڵ خۆی خزاندبێتە ناو نووسینەوە و دانانی، هەروەها لە ناوەڕۆك و بابەتەکانیدا ئەوە بگرێتە خۆی کەلەسەر چۆنێتیەکان بێت وەك: چۆنێتیەکانی دەنگ و ڕەنگ و تام و بۆ کە ناتوانین وێنایان بکەین بەوێناکردنێکی دیار و درەوشەدار، تەنانەت ئەگەر ئەمەشمان دابێت بەدەستەوە ئەوا لەتواناماندا نیە کە ئەو سروشت و**

حاڵەتانە بدەین بەدەستەوە، وەك سروشتی درێژبوونەوە (کشان) و شوێن کەوتەکانی لە ــ شێوە و ژمارە و جوڵە ــ ناچنە ژێرباری زانستێکی بڕوا پێکراوەوە. ئەم سروشتگەنە بابەتی بیرکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرایە و بۆ هەریەکێك لەو سروشتانە بیر و بۆچونێکی (فیکرە)یەکی ڕوون و ئاشکرا هەیە لە دەروون دا. کە لەوانە جیهانێکی هەست پێکراو بێت، جیهانی بەئاگابوون و کردەوە بێت لەشوێنەوارەکانی خەیاڵدا، بەزۆر سەپاندن ناگونجێت بۆ نەهێشتنی بوونی درێژبوونەوە لەجیهاندا یان لەشێوەدا یان لەجوڵەدا، ئەویش بەوەی کە هەموو ئەم شتانە بابەتی بیرکردنەوەی ڕوون و ئاشکرا و جیا کەرەوەیە. (٣٤)

بەلام هەروەها ئەو سەپاندنە دەگونجێ و گریمانەیە بە گریمانەیەکی بەهێزیش. ئەگەر من لە دەروونمدا فیکرەیەك لەبارەی خواوە هەبێت ڕوون و ئاشکراتر بێت لەوەی وا وەسفی ئەو هێز و توانا کامڵ و بێکۆتاییەی پێدەکرێت و لەتوانایدایە جیهانێکی ئەندێشەیی بەرهەم بێنێت کە بوونی نیە، کە لەخۆمانی دەردەهێنێت و پیشانی خۆشمانی دەداتەوە لەسەر ئەو شێوازەی کە ئەندێشە مرۆڤایەتیەکانمانی لێوە دەردەچێت بەو خەونانەی وا دەروونمانی پڕ کردووە لە هەستکردن بەترس هەروەك چۆن لە دەروونماندا هەستەکانی دڵنیایی وبەهیوابوونی دەرپەڕاندوە. ئەوە ئەو خەونانەیە دەتوانن ئەمە بکەن و زیاتریش لەمە ئەنجام بدەن. چونکە هەر یەك لەو خەونانەیە دەتوانن ئەمە بکەن و زیاتریش لەمە ئەنجام بدەن. چونکە هەر یەك لەو خەونانە توانای هەیە لەبەردەم چاوی زەین (چاوی عەقڵ)ماندا ئەو درێژبوونەوە ئەندازەییەمان پیشانبدات لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە تێیدا ڕوو دەدات و ئەو پەیوەندیە ژمارەییەش کە لەنێوانیاندا هەیە، لەهەموو

**دنیادا شتێکیتر لەم بابەتە نیە، کە بتوانێت دەسەلآت بگرێتە دەست بەهۆی هێز و توانایەوە لەسەر بەهێزترین عەقڵ و ئاوەزەکان و بەهەڵەیاندا بەرێت تەنانەت لەبڕیاردانی سەلماندنەکان و ڕوون و ئاشکراترین بینینەکانیش.**

**کەواتە ڕاستە گەر بڵێین ئایا زانستی سروشتی هەرەس دەهێنێت لە بناغەوە؟ ئایا گشت بابەتەکان و ئەو هەموو دڵنیاییە سروشتیە بابەتیانەی کە ئێمە لە ڕابردوودا شانازییمان پێوە دەکردن خۆیان ناشارنەوە و بزر نابن؟ تەنها ئەو سە پاندنەی خواوەندی خەڵەتێنەری وەك ئەمە نەبێت کە ناگونجێت لەگەڵ دەرووندا و قبوڵی ناکات لە بەر دوو هۆی ڕوون و ئاشکرا ئەوانیش: ئەو نەخشەی گومانەی کە وەرمان گرت دژایەتی دەکات و ئەم سە پاندنەش پاشان ئەوە دەبێت کە ناتوانێت سەرکەوتن بەدەست بێنێت لە نێوان فیکرە (بۆچوون)ی ئەم کائینە خەڵەتێنەرە فێڵبازە و لەنێوان فیکرەی ئەو خواوەندەی کە دەروونمان لەسەری چاپ کراوە (طبع بووە) جا ئیتر ئەو فیکرەیە ڕاست بێت یان درۆ بێت. بەڵام ئەم دوو هۆیە لەگەڵ گەورەیی و شکۆمەندیشیان بەس نین و ناتوانن زاڵ بن بەسەر مەترسی خەڵەتاندن و فێڵ کردن لەسەر مرۆڤ، وە ناشتوانن بەرگری لە دەروونی ئەو مرۆڤە بکەن بەهۆی بوونی ئەو نەخشەی گومانەوە کە پێشتر باسکرا. ئەوە ڕاستە کە ئێمە هێشتا ئەوەمان نەچەسپاندووە بڵێین پاش بوونی خواوەندێك هەر ئەوە ئەسڵی بوونمان ئیتر هەر چۆنێك بێت لەسروشتی ئەو ئەسڵە (ڕەسەنایەتیە) جا ئیتر وای دابنێت کە ئەو ئەسڵە خواوەندێك بێت یان بیگەڕێنینەوە بۆ قەزا و قەدەر یان بۆ پێویستنێکی کوێرانە (ضرورة عمیاء) یان بیگەڕێنینەوە بۆ هێزی شاراوە لە دەروونماندا، بێتوو گەر هەر یەکێك لەم سە پاندنانەش بەدی بێن هێشتا**

**ناتوانین بەرەنگاری هەڵە بکەین و زاڵ بین بەسەریدا. دیسان ناشتوانین دەستبەرداری "وەرگرتنی نەخشەی گومان و پشت پێبەستنی" ببین.**

**لەلایەکیتردوە ئەوە ڕاستە کە سەپاندنی خواوەندی بەتوانا لەسەر خەڵەتاندنمان پێك نایەت، بیر و بۆچوونی (فیکرە)ی خوا ئەوەیە کە دەروونمانی لەسەر چاپ بووە ـ ئەوەش بەو جۆرەیە کە ئێمە بەفیترەت وێنای دەکەین و بەکائینێکی سەرتاپاخێر و چاکەی دادەنێین ـ (ئەگەر ئەمە ڕاست بێت) ئەوا سەپاندنی کائینێکی رۆحی دەگونجێ جگە لەخوا لە پلەی کەماڵ و تەواویدا بەڵام بەهێز و فێڵ کەر بەجۆرێك هێزەکەی هیچی کەمتر نیە لەفرو فێڵەکەی و لەتوانایدایە کە زاڵ بێت بەسەر دەروونماندا و بیخەڵەتێنێ لە ئاسانترین دۆخ و حاڵەتدا و زیاتر ئاڵۆزی تێدا بچێنێت و وا شتەکانمان بخاتە پێش چاو کە نەزانین کامە ڕاستە و کامە درۆیە و ئەوەی ڕاست بێت بڵێین درۆیە و ئەوەشی درۆ بێت وا بزانین ڕاستە. ئەگەر هاتوو توانیمان بەرهەڵستی بکەین و زاڵ بین بەسەر وەها کائینێکدا، ئایا لەتوانامانندا دەبێت دوای ئەم کائینە تەئکیدی هەر شتێك لەجیهاندا یان لە زانستماندا بکەین؟ وە ئایا لە پاش ئەمەوە هیچ (زەوی یان ئاسمان یان ئاژەڵ یان مرۆڤ)ی تر هەیە؟**

**دیکارت ئەم سەپاندنە نامۆیەی سەپاند بەڵام دیکارت هەوڵی ئەوەی نەدا شتێك پێش کەش کات بۆ دژایەتی کردنی و نارەزایی بەرامبەری هەروەك چۆن کردی و پیشانی داین کاتێك خواوەندی خەڵەتێنەری سەپاند. نازانین ئامانج چیە لە سەپاندنی شەیتانی فێڵباز؟ وە مانای دەخاڵەت کردنی چیە لەگۆڕەپانەکەدا کە بێگومان هەر دەبێ سنوور و ماناکانی ئاشکرا بن بە ئاشکرابوونێکی تەواوەتی؟ ئایا "شەیتانی فێڵباز" هەڵگری چەمکی ئەزموونە فەلسەفیە مرۆڤایەتیەکانە؟ ئێمە لەم هەڵوێستەدا ڕەخنە و دژایەتی**

ئاراستەی بیر و باوەڕە ئایینیەكان ناكەین لەبارەی شەیتانەوە یان ئەو گیانە پیسەی كە یەخەی مرۆڤ دەگرێت، هەروەك چۆن گیانی شەیتانەكان زاڵ دەبوون بەسەر ئەو نەخۆشانەی وا پێغەمبەران دەیانتوانی چارەسەریان بكەن و چاكیان بكەنەوە. بەڵام لەبەرامبەر سە پاندن دا دیكارت دەیگەڕاندەوە بۆ رابردوو لەو گومانەی كە هەییووە، بۆیە گەڕاندووەیەتیەوە بۆ دوورترین سنوور، بۆ ئەو سنوورەی كە نەخشەی گومان لەگەڵ خودی خۆیدا بووە بەشێوەیەكی ناماقوڵ؟ بەڵام قسەكانی دیكارت ئەم مانایە بەرجەستە ناكەن بەهیچ جۆرێك. وا دەردەكەوێت كە ئەو بەجدی بێت لەو سە پاندنەیدا، بەبێ ئەوەی لەو قسەیەیدا مەبەستی لەشەیتانی ڕاستەقینە بێت.

بەدڵنیاییەوە دیكارت باسی "شەیتانی فێڵباز"ی لە هیچ كتێبێك لەكتێبەكانیدا نەكردووە. هەروەها لە "*وتراوەكان دەربارەی پرۆگرامەوە*" و لە "*بنەماكانی فەلسەفە*"شدا باسی نەكردووە. بەڵام لە "*ڕامانەكان*" دا باسی ئەم سە پاندنەی كردووە لەماوەی دڵنیاییدا بەو ئیعتبارەی كە داینــاوە بەخواوەندی خەڵەتێنەر (فێڵباز)، ئایا دەگونجێت ئەو مەترسیە حەقیقیەی وا تووشی دڵنیایی و زانست دەبێت لە هێز و توانا و دەسەڵاتێكی خواییەوە دەرچوو بێت؟

ئەی گومان دەرناچێت لەسەرەتا و كۆتایی بیر و باوەڕماندا بەبوونی خواوەندێكی بەهێز و توانا و دەسەڵاتدار بۆ ئاستی سنوورێكی وا ئێمەش لە گەڵیا ببینە نمایشكەر بەدرێژایی كات بۆ خەڵەتاندن و فێڵ كردن لەهەموو شتێكدا خوا توانا دار و بەدەسەڵاتە بە ویست و ئازادیە كامڵەكەی لەسەر خوڵقاندن و نەخوڵقاندن، بەتوانا و دەسەڵاتە بە پلەی یەكەم لەسەر ئەوەی

بمانخاتە سەر بیر و باوەڕی هەبوونی جیهانێکی هەستپێکراو، هەروەها وێناکردنی جیهانێکی ماقوڵ، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەمە دا بوونی هەبێت.

ئەوە گومانێکی ڕەها نەبوو کە وا دیکارت دەیەویست بەڵکو تەنها دەربڕینێکی فەلسەفیانە بوو لەبارەی بیردۆزی (تیۆری) خوڵقاندنی حەقیقەتە هەمیشەییەکانەوە. بەڵکو سەپاندنی "شەیتانی فێڵباز" کە دیکارت ڕایگەیاندووە لە "*ڕامانەکان*" دا لووتکەی گومان لەوێدا هیچی تر نەبووە جگە لە ئەڵتەرناتیڤێك نەبێت (بەدیل) بۆ سەپاندنی خواوەندێکی بەتوانا و دەسەڵات لەسەر خوڵقاندنی حەقیقەتەکان بە خوڵقاندن و بەهێز و توانا و دەسەڵاتداریش بێت لەسەر نەهێشتن و لەناوبردنیان.

گومان لای دیکارت ئەگەرچی ئەوەندەی گونجا بوو بەهۆی ئاڕاستەکردنی ڕەخنەکان لەسەری، بەڵام گومانێکی بەکەڵك بوو، بێتوو گەر بەکاری بهێنایە بۆ پاراستن و ژیری و بیرکردنەوە و دەبوویە بەرنامەیەکی ڕەوا و هیچ تەم و مژێکی لەسەر نەدەبوو، بەڵکو ئەو یەکەمین کەسە دەڵێ: ئەوە بەرنامەیەکی سەپێنراوە لەسەر هەموو تاکێکی جدی. لەبەر ئەوەی ئەگەر پێویست نەکات قبوڵی ناکەین تا کاتێك بۆمان دەردەکەوێت ڕاستێتیەکەی بەهۆی سەلماندنی بەڵگە نەویستەوە، بۆیە ڕوونی دەکاتەوە کە یەکەمین ئەرکەکانی فەیلەسووف بریتیە لەوەی کە دەستوور و یاسایەکی ڕەوا دانێت لە تاقیکردنەوەی بیر و بۆچوونەکانی و سەرنجەکانی و هەموو پێداویستیەکان و هۆکارەکانی لە مەعریفە و زانین دا، هەتاوەکو ئاکار و گونجانەکانی دەرکەوێت.

## دەروون لای دیکارت:

لەسەر بنەمای ئەو بەڵگانەی لەمەو پێش وەرمانگرت لە بارەی بیر و بۆچوونەکانی دیکارتەوە ئەویش ئەوەیە کە دیکارت شوێنکەوتەی یاسای هۆکارەکانی مەعریفەیە، نەك یاسا و دەستووری مادده و بابەتە خوێنراوەکان، ئەمەش مانای ئەوەیە دەکرێ ئەو فەلسەفەیە بخرێتە ڕوو کە شێوازی دۆزینەوەی حەقیقەتەکان لەخۆ دەگرێت، تا ببێتە بەدیهێنەرێك بۆ بیرکردنەوە لە هەموو دۆزینەوەیەکدا و دەرخستنی حەقیقەتێکی نوێ، بۆ ئەوەی بنیاتنانێکی تەواوی ڕاشکاوانەی فەلسەفەی باڵا پێك بێت، ئەو جێگیرکردنەش بۆ ئەوەیە تا ڕوون و ئاشکرایی ئەو فەلسەفەیە بگاتە کامڵ بوون و کۆتایی.

بەڕای دیکارت دۆزینەوەی حەقیقەتەکان لەگومانەوە دەست پێدەکات لەهەموو شتەکان و لەهەموو بابەتەکاندا، یان بەخاڵی کردنەوەی زیهن و ئاوەز لەهەموو بڕیار و فەرمانەکانی پێشوو لە نێو ئەو شتانە و ئەو بابەتانە دا، یان خۆ نەبەستنەوە بە بڕیار و فەرمانێکەوە هەر چۆنێك بێت. ڕێگای گومان بەتەنها خۆی دەبێتە زامنی دۆزینەوەی یەکەم حەقیقەت کە ئیتر ئیحتمالی گومان و سەرپێچی ناکات، ئەمەش بە سیفەتێکی جیاکەرەوە دادەنرێت کە ناو دەنرێت بە سیفەتی پیت و فەڕی مەعنەوی، بەوەی کەدەبێتە یەکەم حەقیقەت و حەقیقەتەکانی تریش بە دوایدا دێن لە یاسا و دەستوورێکی داهێنەردا.

تەواوکردنی دەستووری دۆزینەوە، ئەوەی کەدیکارت دەیووت و شوێنی کەوت تا پێشکەوتنی فەلسەفی پێ ئەنجام بدات بەوە نابێت کە گواستنەوەی وتوێژکاری پەیڕەو بکرێت لە یەکەم حەقیقەتەوە بۆ حەقیقەتەکانیترەوەی

گوایە دەوڵەمەندتر و چڕ وپڕترن و زیاتر ئاڵۆزی پەیدا دەبێت لەدۆزینەوەی ئەو حەقیقەتانەدا، بەڵكو بە بیركردنەوە دەبێت لەو حەقیقەتە تا دەبێتە هۆی بیركردنەوەیەكی تر بۆ ئەو حەقیقەتەی كە دوای ئەم دێت و دەبێتە تەواوكەری و حەقیقەتی یەكەمیش دەبێتە تەواوكەری ئەمان. لەبەرامبەر حەقیقەتی یەكەمدا كە دۆزینەوەی تەواو بووە و دەربڕی مەسەلەیەكی وەك ئەوەیە كە دەڵێ *"من بیر دەكەمەوە كەواتە من هەم"* لێرەدا دوو پرسیار لە عەقڵی فەیلەسووفدا ڕاست دەبنەوە كە دەبێ هەر وەڵامیان بداتەوە، ئەگەر بیەوێت زیاتر پێشكەوێت بۆ وەرگرتنی زانیاری نوێ. پرسیاری یەكەم: چۆن چاودێری تێڕامان دەكەیت لەسەر چوونە دەرەوەت لە دەروون بەرەو جیهان و بوونەوەر و بوون؟ كە ئەمەش ناو دەبرێت بە "كۆجیتۆ" و زاراوەیەكە لەسەر بەڵگەی گومان كە دیكارت دۆزیەوە و دایهێنا بۆ چەسپاندنی بوونی دەروون، كە ئەوەش هەوڵدانێكە بۆ چەسپاندن و جێگیركردنی بوونی "خود" لە هەر كردەوەیەك لەكردەوەكانی فیكردا، تەنانەت لەگومانیشدا، *"من بیر دەكەمەوە، كەواتە هەم"*( ٣٥ ) كە من گومانم هەبێت كەواتە سوود بەخشە بۆم بەوەی كە من بیر دەكەمەوە، كەبیریشم كردووە سوود بەخشە بۆم بەوەی بوونی خۆم دەچەسپێنم.

ئەم حەقیقەتەش دەركی پێدەكەین بەتەنها چاو پیاخشاندنێك بەچاوخشاندنەكانی فیكردا: بریتیە لە گومان نە پێوانەیە و نە بەڵگەكاریش، بۆیە پێویستمان بە دەربڕین دەبێت لەبارەی ئەم گومانەوە، پەنا دەبەینە بەر زۆر وشەی یەك لەدوای یەك، بەڵام لەهەموو حاڵەتەكاندا گومان یەكەم دانەیە: من لەگومانی خۆمدا ئەمە دەرك پێدەكەم بەبوونی خۆم، وە بوونی خۆشم پارێزراوە لە فیكرمدا، وە فیكریشم ئامادەیە لە دەروونمدا

بەئامادەبوونێکی ڕاستەوخۆ، گریمان کە شەیتانێکی پیس لە ڕێ لام دەدات و وێڵ و گومڕام دەکات لە هەموو شتەکاندا بەڵام ناتوانێت ڕێگرییم بکات لەوەستان لەئاستی ڕاستگۆییدا، وە ناشتوانێت ڕێگریم بکات لەو دڵنیاییەی کە من خۆم هەم کاتێك بیر دەکەمەوە.( ٣٦ )

بەڵام چی لە "کۆجیتۆ" دا زامنی من دەکات کە من ناحەق دەڵێم؟ هیچ شتێك هەرگیزاوهەرگیز... بۆیە من بەبەرچاو ڕونیەکی بەهێزەوە ئەوە دەبینم کە بۆ ئەوەی بیر بکەمەوە پێویستە من خۆم هەبم ( ئامادە بم ). دووبارە من خۆم دەتوانم بنکەیەکی گشتی وەرگرم بۆ دەروونی خۆم، ئەویش ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانەی دەرکیان پێدەکەین بەدەرك پێکردنێکی ئاشکرا و جیاکراوە هەموویان حەقیقەتن. دیکارت دەڵێ: کاتێ خەبەرم بوویەوە و بەئاگا هاتمەوە زانیم کە ئەمە حەقیقەتە. من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم، ئەمە لەچەسپاندنەوەیە بە جۆرێك ( ئیرتیابیەکان ) ناتوانن جێی پێ لەق کەن هەر چەندە سەپاندنەکانیشیان ( گریمانەکانیشیان ) زیاد لە پێویست لە ڕادە دەرچوون بن، بڕیاری ئەوە دەدەم کە من خۆم دەتوانم بەدڵنیاییەوە ئەمە بە ئەسڵێك وەرگرم ( دابنێم ) بۆ ئەو فەلسەفەیەی کەمن داوای دەکەم.( ٣٧ )

دیکارت ئەوەی دەبینی کە ئێمە ناتوانین سەپاندن ئەنجام بدەین، چونکە ئێمە بوونمان نابێت کاتێك گومانمان هەبێت لەهەموو شتەکان. بوونی "کۆجیتۆ" لە ڕێکخستنی ژیربێژیدا ئەوە یەکەمین دۆزینەوەیە لە دۆزینەوەکانی فەلسەفە مەزنەکە، وە بەهۆیەوە دەگەینە ئەو حەقیقەتە واقیعەی بەجۆرێك بێت بگوێزینەوە لە ژیربێژی، ئەوەش زانستی وێنەکانی فیکرە بۆ میتافیزیقا ( ئەودیوی سرووشت ) کە ئەمەش "زانستی بوون"ە لە

"کۆجیتۆ" دا بینیمان پێناسەی ڕاستەوخۆی گومان لەبوونمان، پێناسەیەك بۆ سروشتێکی ئاسان، کە ئەوەش (منی خۆم و خودی بیرکەرەوەی خۆم) بوو.

ئەو بوونەی وا درکی پێدەکەین لەو کاتەشدا درك بەبوونمان دەکەین، ئەوە بوونێکی جەسەدی نیە، بەڵکو ئەوە بوونێکی فیکریە، من ئەزانم ئێستا خۆم هەم و بیر دەکەمەوە، وە ئیتر هیچیتر نازانم بێتوو گەر شتێکیتر بم جگە لەم بوونە بیرکەرەوەیەم. وە من بیر دەکەمەوە، بەو مانایەی من هەم و دە ئاوەزێم و (خاوەن عەقڵم) و گومانیش دەکەم، جێگیر دەبم، ڕەت دەکەمەوە، دەمەوێت و نامەوێت، خەیاڵ دەکەمەوە و هەروەها هەستیش دەکەم. هەموو ئەم واقیعە ڕەسەنە بەڵگە نەویستانە کە ڕەت ناکرێتەوە و پاڵیان پێوە نانرێت و دەمێننەوە دوور لەگومان هەر چەندە ئەو گومانە زاڵیش بێت، ئەمەش ئەوەیە کە بینای فەلسەفەی داهاتووی لەسەر بنیات دەنرێت. "*من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم*" من "شتێکی بیر کەرەوەم" هەروەها من بەسروشت و ماهییەتیش شتێکی بیرکەرەوەم، وە من ناتوانم واز لە بیرکردنەوە بێنم بە بێئەوەی واز لەبوون نەهێنم، لەڕاستیدا من هەمیشە بیر دەکەمەوە، بیر دەکەمەوە و من منداڵێکی بچووکم، لەکاتی خەویشدا هەر بیر دەکەمەوە، هەروەها لەحاڵەتی بێئاگایی و ناهۆشیاری و نەستیشدا هەر بیر دەکەمەوە، لەهەموو حاڵەتێك و بارودۆخێك من هەر بیر دەکەمەوە با ئەو بیرکردنەوەیەش نادیار و ئاڵۆز و شاراوە بێت و پێك هاتبێت لە هەستکردنە (بۆشەکان) خاڵیەکان ئەوانەی وانە هۆشیاریان تێدایە و نەویژدان.

فیکر جیا دەکرێتەوە لە بەدەن و جەستەکان، بەڵام بوونی فیکر زیاتر بڕوا و جێگیری تێدایە لەبوونی جەستە، من پێناسەی فیکر بەفیکر خۆی دەکەم، بەڵام جەستەکان لەتوانامانـدا نیە دەرکیان پێ بکەین تەنها لەفیکر

(بیرکردنەوە) دا نەبێت بەفیکر (بیرکردنەوە). زانین و زانیاریەکانم بۆ دەروون زانین و زانیارییەکی ڕاستەوخۆی دڵنیاییە، جەستە ناناسم تەنها بەگومان و خەملاندن نەبێت.(٣٨)

لەکاتێکدا دەروونم دەرك بەوە دەکات وەك بیرکەرەوەیەکی کردەیی‌یە، ئەو کاتە بەڕاستی دەرك بەبوونم دەکەم، بەڵکو دەرك بە زیادیەك دەکەم لەبارەیەوە، دەرك بەهەموو منێتیەکی خۆم دەکەم لەسروشت و ماهیە تما، لە واقیعدا منێتیم تایبەت نیە تەنها ئەوە نەبێت هەیە بۆ تەواوکردنی کرداری "کۆجیتۆ"، بەم مانایە کەواتە هەروەها من هەم و گومان دەکەم و هەست دەکەم و خەیاڵ دەکەم و دەمەوێت. بەلام هەروەها من بۆ ئەوەی گومان بکەم و هەست بکەم و خەیاڵ بکەمەوە و ئیرادەم هەبێت بۆ ناکرێت تەنها بە "کۆجیتۆ" نەبێت لەبەر ئەو یەکەمە لە حەقیقەتی فیکری مندا. دووبارە فیکر تەعبیر لەهەموو سرووشتی من دەکات، ئەوەش ماهیەت و سیفاتی خودیە(زاتیە)، هەر شتێك بگونجێت لە گەڵ فیکردا لەگەڵ منیشدا دەگونجێت، وە هەرشتێك فیکر نەیەوێت منیش نامەوێت. ئەوە درێژبونەوە نیە و هیچ شتێکیش نیە کە ببێتە هۆی نووشتانەوە و دەق گرتن لەفیکرمدا لەسەر درێژبوونەوە، چونکە فیکر لەشیکردنەوەی خۆیدا ناچێت بەلای شتێکی وەك درێژبوونەوەدا، هەروەك چۆن درێژبوونەوەش نانووشتێتەوە بەسەر شتێکی وەك فیکردا.

یەکەمین شتێك دیکارت بەرهەمی هێنا لە بیر و بۆچوونی "کۆجیتۆ"دا بریتی بوو لە جیاکردنەوەی یەکجارەکی (کۆتایی) لەنێوان هەر دوو سروشتی دەروون و جەستەدا، وە چەسپاندن و جێگیرکردنی سەربەخۆیی تەواوی دەروونمان لەجەستەمان: دیکارت پاش ئەوەی دڵنیایی تەواوی وەرگرت بەوەی کە هەیە، تەئکید بوو لەوەی کە دەتوانێت وێنای ئەوە بکات کەهەرگیز

جەستەیەكی ڕەها نیە نە لەهیچ شوێنێك و نەلەجیهانیشدا، بەڵام لەتوانایدا نەبوو لە پێناوی ئەمەدا دەروونی وێنای ئەوە بكات كە بوونی نیە، دووبارە ( منێتی ) یان ( خودی بیركەرەوە ) هەیە، تەنانەت واش دابنێین كە بەدەن بوونی نیە.

دیكارت لە *"وتارێك دەربارەی میتۆد"*ەوە دەبینێت بەبوونم فیكرم گومانی دەبێت لە حەقیقەتی شتەكانیتر و دەیەوێت تەواوی كات بەتەواوكردنێكی دەرەوشاوەی دڵنیایی تاوەكو بڵێم من خۆم هەم، لەكاتێكدا ئەگەر من خۆم وەستام و وازم هێنا لەبیركردنەوە ئەگەر وای دابنێین ئەوەی من لەگەڵیا دەڕۆم لەوێناكردنەكەمدا ڕاست بێت لەوەی كە دەشێ بڕوا بكەم بەبوونی خۆم. لەمەوە زانیم جەوهەری هەموو ماهیەتێكی من لەبیركردنەوە دایە، بۆیە پێویستم نیە - بۆ ئەوەی هەبم - بەهیچ شوێنێك، پشت نابەستم بەهیچ شتێكی مادی، بەو مانایەی ئەو دەروونەی هەڵدەسێ بە ( منێتی ) من جیاوازە و جیاكراوەیە لەجەستە ( بەدەن ) بەجیاكردنەوەیەكی تەواو، بەڵكو زانین تێیدا ئاسانترە، مادام جەستە بوونێكی ڕەهای نەبێت هەرگیز، ئەوا دەروون بوونێكی كامڵ و تەواوی دەبێت.( ٣٩ )

دەروون بە پێی چەمكی تێگەیشتنی دیكارت جەوهەری بیرمەندە و هیچ لەخۆی ناگرێت تەنها هۆشیاری و بیركردنەوە نەبێت. ئەگەر سەرنجی كردەوەكانی بیركردنەوەكانمان بدەین، بەو پێودانگەی كە هەر بیرۆكەیەك ( فیكریەك ) هیچیتر نیە جگە لەوەی ( بیركردنەوە ) نەبێت بەمەبەستی بابەتێكی دیاریكراو لەخۆدا. ئەگەر هاتوو بیروبۆچوونی خۆمان زۆر ورد كردەوە ئەوا لەوانەیە بڕۆین بەرەو پیری تەنها یەك دانەیان، كە لەو دانەیەشەوە تێڕامانێك نە دەروونەوە دەردەچێت بۆ بوونێكی دەرەكی، بێگومان

دەبێتە هۆی بەدیهێنانی بۆچوونێك لە بیروبۆچوونەكانی دەروونـدا بۆ دابەشكردنی ئەو بیر و بۆچوونانە بۆ سێ جۆر: یەكەم: بیر و بۆچوونە دەركییەكان یان ئەو ڕێگرییە دەرچوانەی لەهەستەكانەوە دەردەچن و دەبنە بەڵگە و سەلماندن لەسەر بابەتە دەرەكییەكان و دەیان شوبهێنن وەك بیر و بۆچوونەكانی ڕەنگ و دەنگ و چێژ ( تام ) و ئاوێتەكانیان لە بیر و بۆچوونی جەستەكان و ڕووداوەكان.

دووەم: بیر و بۆچوونە دروستكراوەكان ئەوانەی وا ئەندێشەو خەیاڵ دروستیان دەكات لەسەر بنەمای ئەو بیروبۆچوونە دەرەكیانەی پێشەوە بە ئاوێتەبوونێكی ناوازە كە هەندێكیان كۆ دەكاتەوە لەگەڵ هەندێكی تریاندا، یان پارچەكانی هەندێكیان كۆ دەكاتەوە لەگەڵ پارچەكانی هەندێكی تر دا.

سێهەم: بیروبۆچوونە فیطرییەكان بەوە پێناسە دەكرێت كە تەنها بەتێڕوانین لە سروشتیان دەیانناسینەوە، وەك بیر و بۆچوونمان لەبارەی شت و بوون و دەروون و ڕاستی و درێژبوونەوە، دواجاریش لەبارەی خواوە.

هەموو ئەو بۆچوونانەی باسمان كردن جێگیرن لە دەروونـدا و گومان لەبوونیان نیە، هەر چەندە چەند بابەتێكی دەرەكی لەبەرامبەریاندا بوونیان هەبێت یان بوونیان نەبێت. بۆمان دەردەكەوێت كە دەروون پێویستی بە هەست و ئەندێشە و بیركردنەوە نیە لە "خود"ی خۆی و لەبوونی و لە كەم و كوڕیەكانی و لەو درێژبوونەوەیەش كە زانستی ئەندازە لێی دەكۆڵێتەوە.( ٤٠ )

با وای دابنێین هەموو ئەو بیر و بۆچوونە جیاوازانە ڕێپیشاندەرمان دەبن بۆ یەك جۆریان كە لێوەی بچینە دەرەوە بۆ جیهان و بوونەوەر ( كەون ) و بوون، وە لەیەكەمین بیروبۆچوونەوە دەست پێدەكەین كە ڕاستەوخۆ ڕێنماییمان دەكات لەسەر بوونی بابەتە دەرەكییە لێك چووەكانی خۆی، لەم بیر و بۆچوونەدا

داوایەکی ئاشکرا هەیە بۆ بوونێکی دەرەکی کە دڵنیاییمان لەگەڵ خۆیدا بۆ جێگیر کات، لەوانەشە بەهۆیەوە بگەینە بەدیهێنانێك بۆ بنچینەی دڵنیایی و بوون.

بەڵام توێژینەوە لەبارەی یەکەمین بیروبۆچوونەوە نامان گەیەنێتە ئاکامێکی وا، پاش ئەوەی بەدەستمان هێنا لە کارتێکردنەکانی گومان لەهەستەکاندا، وە لە بابەتە دەرەکیە هەست پێکراوەکاندا بەشێوەیەکی گشتی. لەنێوان ئەوەی کە بەڵگەداری ئەم بیر و بۆچوونە لەسەر بوونی بابەتە دەرەکیەکانی هاوشێوەی خۆی، بەڵگەداریەکی لاوازە وەك هەموو زانینە هەستاوەریەکانمان. ئەم بەڵگەداریە پشت بەکام بنچینە و بنەما دەبەستێت؟ بۆ هەستکردنی ناوەوەمان بەهەستان بەو بیر و بۆچوونە تیاماندا بەبێ ویستی خۆمان بەرەو ڕووی دەچین و بانگ کراوین بۆی؟ یان بۆ هەستکردنمان بەهێز و گوڕو تینی خۆیەوە؟ جگە لەوەی کە خەونەکانمان زۆر یاوەریمان دەکەن بۆ ئەم هەستکردنە، (٤١) بەبێ‌ئەوەی داواکار بین لەکاتی بەئاگابوونماندا لێی بۆ بوونی ئەو ڕووداوانەی کە لەخەونەکانماندا پیشانمان دەدرێت. ئایا بەڵگەداری ئەو بیر و بۆچوونە پشت نابەستێت بە ئارەزووە سروشتیەکانمانەوە و پاڵمان پێوە نانێت بۆ دڵنیا بوون لەبابەتەکانی ئەو بیر و بۆچوونانە و هەروەها بۆ بەستنەوەی ئەو ئارەزووە سروشتیانە بە ژیانی کردەییمانەوە؟ بەڵام چەند جار ئەو ئارەزووە ڕێبەرایەتیمان دەکات، وە چەند جار ڕێبەرایەتی ئەو حەزەمان دەکات بۆ توێژینەوە لەبارەی شتە زیان بەخشەکان کە دەبنە مایەی زەرەر و زیان بۆمان، هەروەها چەند جار ئەو ئارەزووە ڕێبەرایەتیمان دەکات بۆ کارە شەڕەنگێز و زیانبەخشەکان بە دەروونمان و پێمان بڵێ ئایا ڕاستە ئەم جیهانە بوونێکی هەبێت؟

ئاشكرایە كە ئەم سرووشتە كوێرانەیەی وا ئارەزووەكانی خۆی دەسەپێنێت بەسەرماندا بەجارێك پێچەوانەی ئەو ڕووناكی‌یە عەقڵیە سروشتیەمانە كە ڕێنیشاندەر و یاوەرمانە بۆ هەر یەكە لە حەق و چاكە.

بۆیە بێگومان دەبێ لەو بیر و بۆچوونە دەرەكیە ڕێگرە دوور كەوینەوە، یان چاو پۆشی بكەین لەو بانگەشەیەی كە دەیكات بۆ بوونی بابەتە دەرەكییەكانی هاوشێوەی خۆی. بێگومان ئەو بیر و بۆچوونە لەدەروون دا ڕیشەی داكوتاوە. هەروەها دووركەوتنەوە پێویستە لەبیر و بۆچوونە دروستكراوەكان ئیتر نرخەكەی هەر چۆنێك بێت چونكە لەبنەڕەتدا ئەوە لەبیر وبۆچوونە هەستاوەریەكانەوە دەرچووە و هەر لەسەر ئەوەش دەبێتە هەڵگری زامن كردنی بانگەشەكانی بۆ بوونێكی دەرەكی كە ناكرێ دوا بخرێت بەهیچ شێوەیەك لەشێوەكان.

بیر و بۆچوونی فیطری لەئاستی خۆیدا هەڵگری ئەو بانگەشە ناوبراوانە نیە، بوونی كوت وپرێەكی دەروون نیە هەروەك چۆن ئارەزووی بەهێزی تیا نەژیاوەتەوە بۆ بڕیاردان لەبابەتە دەرەكییەكان. وە دەبێ هەر بپرسین لەبارەی ڕێگە چارە بۆچوونە دەرەوە لە دەروون؟ بێت و گەر لەدەروون دا جگە لە بیر و بۆچوون هیچی‌تری تێدا نەبێت، بێگومان دەبێ جارێكی‌تر سەیری ئەمە بكەینەوە، بۆ ئەوەی ئیعتبارێكی تازەی بۆ دابنێین، لەوانەیە بوونێكی ڕەها بدۆزینەوە لە دەرەوەی دەروون. ناچار دەبین بەخۆپارێزی لەتەشەنەكردنی بانگەشە ناوبراوەكانی و چۆنایەتیە هەستاوەریەكانی و گریمانەی زانینی ئەو چۆنایەتیانە لە هەڵەكان و هەڵخەڵەتاندنەكان. لە ڕوانینمان بۆ بوونی بیر و بۆچوون لە دەرووندا، بۆمان دەردەكەوێت كە دوو مانای جیاوازی هەیە بە هەموو جیاوازیەكانەوە. بۆ هەموو بیرۆكەیەك (فیكرەیەك) بوونێكی وێناكردن

یان کردەیی هەیە، حەقیقەتێکی وێناکردن یان کردەییە، بۆ هەموو بیرۆکەیەک (ڤیکردیەک) بوونێکی بابەتی یان نمایشیە، حەقیقەتێکی بابەتیە یان نمایشکاریە.

بیرۆکە ئامادەیە لە دەروونمدا بەکردەیی لەکاتێکی دیاریکراو دا پاش بیروبۆچوون و پێش ئەوانیتر، بەم مانایە جیاوازی نیە لەنێوان خودی بیر و بۆچوون خۆیدا. هەموویان هەلگری وێنە یان سرووشتی فیکرن، وە لە هەریەکەیاندا (تێکەڵبوونێکی) لێکچوونێکی کاتی کردەیی دیاریکراو هەیە، بەلام لەڕووی بوونی بابەتی و نواندنەوە بیر و بۆچوون جیاوازی و لێک نەچوون هەیە. ئەم بیرۆکەیە (فیکرەیە) بابەتێکی دیاریکراو نمایش دەکات و ئەوەش بابەتێکیتر و ئەوەش سێگۆشەیەک یان بازنەیەک یان ئەسپێک یان مرۆڤێک یان سیفەتێک لە سیفەتەکانی مرۆڤ، یان سەرمایەدارێک یان خوایەک.(٤٢)

## خودا لای دیکارت:

بەسەرنج دان بەوەی کە دیکارت پاش ئەوەی بوونی خودی خۆی سەلماند (چەسپاند) بەوەی کەخۆی شتێکی بیرکەرەوەیە یان جەوهەرە، بۆیە ئاوڕی دایەوە لە توێژینەوەیەک کە هەموو جارێک لە حالەتی تێڕامان و بیرکردنەوە لە بیر و بۆچوونەکاندا دەبوویە بەربەست لەبەردەمیدا، ئەوە بوو لەدەروونی خۆیدا فیکرەیەکی دۆزیەوە کە زالە بەسەر هەمووانـدا بۆ چەسپاندنی بوونی خوا. بەدەستپێکردنی هەندێ بەلگە و سەلماندنی هەلقولاو لەخودی خۆیەوە و لەبیر و بۆچوونە عەقلانیەکانیەوە. ئەوەش:

بەلگەی یەکەم: توێژینەوە لەماهیەتی ئەم بوونە بابەتیە بۆ بیروبۆچوونەکان پەل کێشمان دەکات بۆ سەلماندنی یەکەم (بەلگەی یەکەم)

لەسەر بوونی خوا و خستنەڕووی ئەم بەڵگەیە، پێویستە لەسەرمان جیاوازی بکەین لەنێوان ئەو بوونە بابەتیەی بیر و بۆچوونەکان کە توێژینەوەی لەبارەوە دەکەین و ئەو بانگەشەی بیر و بۆچوونە هەستاوەریە ڕێگرەش کە هەیە بۆ بوونی بابەتە هاوشێوەکانی خۆی. هەر چەندە ئەوەمان خستە ڕوو کە ئەم بانگەشەیە هیچ نرخێکی نیە. مەبەست و ئاما نجیشمان ئەوە نیە کە بەڵگە بێنینەوە بەهیچ بیرۆکەیەك لە بیرۆکە هەست پێکراوەکان بێت یان جگە لە هەستپێکراوەکانیش بێت لەسەر هەبوونی بابەتەکانی بیر و بۆچوونەکان هەر چۆنێك بن، ئێمە لێرەدا تیروتوانج ناهاوێژین بۆ چەسپاندنی بوونە سروشتیەکەی. بەڵکو دەبینە یارمەتیدەرێك بۆ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی ئەو بیر و بۆچوونانە لەخودی ئەو بوونە خۆیدا.

گومان لەوەدا نیە کە جیاوازی هەیە لەنێوان بیر و بۆچوونەکاندا لەڕووی بوونە بابەتیەکەیەوە: بیر و بۆچوونم لەبارەی سێگۆشەوە جیاوازە لەبیر و بۆچوونم لەبارەی بازنەوە و هەروەها جیاوازیشە نە بیر و بۆچوونم لەبارەی مرۆڤەوە، بەدڵنیاییەوە لێك نەچوونێکی کەم و زۆر هەیە لەنێوان بیر و بۆچوونەکاندا لە ڕێکخستن و پلەداری ئەو بوونە بابەتیەدا. بیر و بۆچوونم لە بارەی مرۆڤەوە هەمان ئەو بیر و بۆچوونە نیە لەبارەی سیفاتەکانی ئەو مرۆڤەوە بۆ نموونە لەبارەی ڕەنگیەوە یان دەنگیەوە یان زیرەکیەوە، ئەمەش ئەو بیرۆکەیە کە لەجەوهەرەوەیە، لەکاتێکدا ئەو بیر و بۆچوونانە لەبارەی ئەو جەوهەردوە ڕێگری دەکەن، هەروەها بیرۆکە و فیکرەم لەبارەی خواوە هەمان بیرۆکە نیە لەبارەی مرۆڤەوە و لەبارەی یەکەمین جەستەوە لە جەستەکان. چونکە ئەمە فیکرەیەکی بڵندنما و ئەزەلی و بێکۆتایی و جێگیرە، خاوەنی زانین و زانیاری و هێز و توانای تەواوە، دروست کەری هەموو شتەکانی

دەرەوەی خودی خۆیەتی، هەروەها فیكرەیەكی وای هەیە كە خاوەنی بوونێكی بابەتیانەی زیاترە وەك لەو خاوەندارێتیەی بیر و بۆچوونە جەوهەریە كۆتایی دارەكان هەیانە.(٤٣)

دەكرێ بپرسین لەبارەی ڕاڤەكردنی بوونە بابەتیەكانی بیر و بۆچوونەكان و هۆكارەكان و كەم و كوڕیەكانی لەچیەوەیە؟ بەدڵنیاییەوە لەبوونی وێناكردنیەوە پێویستی نابێت بەهۆكاری دەرەوەی خودی دەروون خۆی. بەڵام ئەو بیروبۆچوونانە لە بوونی بابەتیاندا جیاوازی و لێك نەچوون هەیە لەنێوانیاندا، توێژینەوە پێویستە لەبارەی كەم و كوڕیەكانی ڕاڤەكاری نواندنەكانی (نمایشەكانی) بابەتەكان و جیاوازیەكانی لەم نمایشەدا. نابێت سە پاندنی بابەتە دەرەكیەكان كار بكاتە سەر دەروون و پشتگیری لێ بكرێت بە بیر و بۆچوونە جیاوازەكان، لەوانەیە پرسیارێك بكەین لەبارەی هۆكاری بابەتی بوونی بیر و بۆچوونەكان و نهێنی جیاوازیەكان و لێك نەچوونەكانی نێوانیان؟ وەڵامەكەش ئەوەیە كە هەرچەندە لەم كاتەی ئێستاماندا توێژینەوەمان لەسەر كردن لەسەر هەموو ئەو بیر و بۆچوونانەی كە دەستمان كەوتن و دۆزیمانەوە ـ تەنها یەكێكیان نەبێت لەوانە ـ ئەویش هۆكارەكەی لە دەرەوەی خودی دەروون خۆیدایە. لەوەی بەیەكسانی نیگامان بڕوانێت بۆ ناوەڕۆكی بابەتەكانی ئەو بیر و بۆچوونانە ئایا لە كەم و كوڕیەوەیە یان لە حەقیقەت و كەماڵەوەیە ئەو خۆسەپاندنەی كە خۆی پێ دەسەپێنێت، ئەو فیكرانەش وەك گەرما و سەرما و تاڵی و شیرینی و هەموو ئەوانەشی كە شتێك لە ناوەڕۆكیاندا نیە جگە لەتەنها حەقیقەتێكی بابەتیانەی لاواز نەبێت و ئەو كەم و كوڕیانەشی كە تێیاندایە دەكرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ئەو كەم و كوڕیانەی لە دەرووندا هەیە و دەبنە هۆی ڕوودانی

هەڵەكان و فرو فێڵ و هەڵخەڵەتاندن.( ٤٤ ) بەڵام هەندێكیان كە لە ناودرۆكیاندا حەقیقەتێكی بابەتیانە هەیە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێز و توانا و كامڵیەی كە لە دەرووندا هەیە. بەڵام بیر و بۆچوونە بیركاریەكان جگە لەوەی لە پوختی و جیاكردنەوەیەكی گەورە نمایشكاری بۆ دەروون دەكەن بەو هێندەش دەروون دوور دەخەنەوە لە پەیوەندی كردن بە جیهانی دەرەكیەوە ئەوەی كە بانگەشەی بوونی دەكات ـ سەرباری ئەمە ـ شتێكی وای تێدا نیە ئیجبارمان كات لەسەر ژماردنی توانای دەروون لەسەر نواندنەكانی و پێكهێنانی هەندێكیان لە هەندێكی‌تریان. هەروەها هەمان حاڵەتیشی وابەستەیە بە بیر و بۆچوونە ئاشكرا و جیاكراوەكا نمانەوە لەبارەی جەستەكانەوە ( تەنەكان )ەوە ئەو جەستانەی كەدەكەونە دەرەوەی ئەو ئاماژەكردنانەوە كە ئاماژەمان بۆ كرد وەك: گەرم و سارد و تاڵ و شیرین، وە ئەو جەستانەن كە هەڵگری ئەو تایبە تمەندیانەن وا نمایشكار یان بەڕوونی و جیاكراوەیی تەواو لێ دەردەكەوێت لەبەر هیچ هۆیەك نا تەنها لەبەر ئەوەی كە گەڕانەوەیان لەكۆتایی حاڵەتەكاندا دەگەڕێتەوە بۆ تایبە تمەندێتیە بیركاریەكانی وەك: ماوە و شێوە و ژمارە.

هەروەها بیر و بۆچوو نمان لەبارەی ئەم تایبە تمەندێتیانەوە داوای چوونە دەرەوەمان لە دەروون و لەو هێز و توانایەی لەسەر وێناكردن و ڕێكخستن هەیەتی لێناكات.( ٤٥ ) ماوەتەوە بیر و بۆچوو نمان لەبارەی خەڵكانی‌ترەوە و لەبارەی فریشتە ( مەلائیكەت ) و هەروەها لەبارەی خواوە:

بیر و بۆچوو نمان لەبارەی خەڵكەوە هیچ جیاوازی نیە لەو بابەتەی كە دەیزانین لەبارەی دەروونی خۆمانەوە و هەمان بیرو بۆچوونە، بەڵام بیر و بۆچوون لەبارەی فریشتەوە بە زۆری تێكەڵەیەكە ( پێكهاتەیەكە ) لە بیر و

بۆچوونمان لەبارەی دەروون و لەبارەی جەستەکانەوە( ٤٦ )، بەڵام فیکرەی خوا ئەوەیە ــ بەلانی کەمەوە لە یەك ڕووەوە ــ هۆکارێك دەگرێتە خۆی کە لەدەردوەی دەروون و دەرەوەی هێز و تواناکانی دەروونەوەیە لەسەر بیرکردنەوە.

توێژینەوە لە دەروون و ناوەڕۆکەکەی دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە تێڕامان بکەین لەفیکرەی خوا و هەوڵ بدەین لە ڕووی حەقیقەتێکی بابەتییەوە تەفسیر و ڕاڤەی بۆ بکەین، یان لەڕوویەکی ئەو بابەتەوە کە تەنها نمایشکاری ئەوە دوور لەبابەتەکانیتر. وەك سەرنج دەدەین فیکرەی خوا بریتیە لە فیکرەی کائینێکی کاملی بێکەم و کوڕی ئەزەلی کۆتایی نەهاتووی خاوەن زانین و زانیاری و هێز و توانای تەواو، وە هەر ئەو دروست کەر و بەدیهێنەری هەموو شتەکانە. ئەو فیکرەیەش لە دەروونەوە هەڵدەقوڵێ بە هەڵقولانێکی سروشتی، بۆ دەرچوونی ئەوە بەسە کە بیر لە خۆمان بکەینەوە و لەو بوونەمان کە هەڵگری کەم و کوڕی و هەروەها لەخستنە ڕووی ئەو گومان و فڕو فێڵەی کە لەبیرکردنەوەماندا هەیە پاشان لەو بەدەست هێنانەی کە ئێمە بەدەستی دێنین لەسەری لە حەقیقەت و کەماڵ و ئارەزووی دوورکەوتنەوە لە بابەتە کەم و کوڕی دارەکان و گومان و فڕو فێڵ و هەڵەلەتاندن. ئەم بیرکردنەوەیە بەسە لە دەروونی خۆماندا لەسەر ئاڕاستەیەکی ڕاستەوخۆ بۆ گەیشتنە بیرکردنەوە لە کائینێکی کامڵ و تەواو.( ٤٧ ) لەبەر ئەوە بیرۆکەی ( فیکرەی ) ئەم کائینە ئەو یەکەمین فیکرەیە کە نواندن ( نمایش ) بۆ دەروون دەکات نواندنێکی سروشتی لەگەڵ فیکرەی دەروون لەبارەی خودی خۆی و بوونی خۆیەوە و بەوەی کە بەستراوەتەوە بەم فیکرەی دواییەوە بە بەستنەوەیەکی ڕاستەوخۆ.

ئێستا دەپرسین لە کوێوە ئەم فیکرەیەمان بۆ هات؟ ئەگەر ئەوە بێت وا لەمەوپێش باسمان کرد ئەویش ئەوەیە کە بۆمان دەسەلمێنێت هیچ بابەتێکی دەرەکی تەفسیری ناکات. پاشان ناشگونجێت کە دەروون هۆکارەکەی بێت، چونکە دەرون ناتەواو و سنووردار و کۆتایی هاتوە و خاوەنی کائینێکی بێکۆتایی و تواناداری وا نیە کە خۆی بنوێنێت ( نمایش کات ) بە فیکرەکەیەوە. ئەوەش ناگونجێت کە نزم و نەوی تەفسیر و ڕاڤەی بەرز و بلند نما بکات.

دیسان ناشگونجێت کە دەروون بەتەنها هەر خۆی هۆکاری بیرکردنەوە بێت لەکائینێکی کامڵ و تەواوی بێکۆتایی. وە ناکرێ ئەوەش بووترێت کە لە خوادا چەند ژمارەیەك لەکاملی هەیە، لەوانەیە بتوانم بەهۆی ئەزموونی خۆمەوە بەدەست هێنانێك لەسەر بیر و بۆچوونەکانی بەدەست بێنم و هەموو ئەو بیر و بۆچوونە و ئەوەی کە لەنێوانیشیاندایە کۆبکەمەوە و فیکرەیەکیان لێ پێك بێنم بۆ کائینێکی کامڵ و تەواو. ئەمە شیاو نیە چونکە فیکرەی من لەبارەی خواوە لەخودی خۆیدا کەوتۆتە ناو یەکگرتنێکی ڕاستەوخۆی کردەیی بۆ هەموو کاملیەکان ( بێکەم و کوڕیەکان )، ئەمەش گرنگە بۆ کرانەوەی عەقلم لەبەرامبەر جیاوازیەکانی نێوان ئەو کاملیانە.

ناشگونجێ کە بڵێم من ئەو کەسەم کە فیکرەی بێکۆتاییم دروست کردووە ( پێك هێناوە ) لەسەر بنەمای پشت بەستن بە کاملی بێکۆتایی جێگیر و بەهێزی دەروونی خۆم، لەسەر پشت بەستن بەتوانای دەروونم بۆ بەرەو پێش چوون و پێشکەوتن بە پێشکەوتنێکی یەك لە دوای یەك بۆ ئەو کاملییە بێکۆتاییەی کە وێنای دەکەم. ئەمەش ناگونجێت لەبەر ئەوەی ( بێکۆتایی ) وەك ( کاملیی ) ئامادەیە لەخوادا بەکردەیی چونکە فیکردی من لەبارەی کاملیی

خواوە ناگاتە ئەو كۆتاییانەی كە وام لێ بكات خەیاڵ و وێناكردنم بۆی بچێت و تێبگەم لەسنوور و بوون و ناتەواویەكانی خۆم. ئەم فیكرەیە لە دەروونمدا بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا بەوەی نیشانەی دروستكارە لەسەر دروستكراوەكەی.

بۆ ڕاڤەكردنی فیكرەی كائینێكی كامڵی بێكۆتایی حەز دەكەم بچمە دەرەوە لە دەروون و بڕیاری ئەوەش بدەم كە ئەم كائینە كامڵە بێكۆتاییە هەیە و ئامادەیە بەوەی كە هۆكار و نیشانەی ئەو فیكرەیەش تاك و تەنهاییە.(٤٨)

بەڵگەی دووەم: دیكارت بڕیاری ئەوەی دا ئەو ناڕەحەتیانەی بەڵگەی یەكەم هەڵی گرتووە هێشتا دامالینی تەواوی پێوە دیار نیە لەبیر و بۆچوونەكانی خۆی و لەزۆر لایەنەوە ڕوو وەردەگێڕێتەوە بۆ سەر بیر و بۆچوونەكانی خۆی، بۆیە بەباشی زانی پشتگیری بەڵگەی یەكەم بكات و تەواوی كات بە بەڵگەی دووەم كە وا دەردەكەوێت لەو ئاسانتر بێت و زیاتر نزیك بێتەوە لەمەبەستی داواكراو. ئەویش بەگۆڕینی ڕێگەی توێژینەوە لەبارەی هۆكاری فیكرەكەیەوە لەسەر كائینێكی كامڵی بێكۆتایی، هەوڵیدا توێژینەوە لەبارەی هۆكاری بوونی خۆیەوە بكات چونكە ئەو بوونەیە بیر دەكاتەوە لە كائینێكی كامڵی بێكۆتایی *"من بیر دەكەمەوە كەواتە هەم"*. من كائینێكی بیركەرەوەم یان ئەوە دەزانم كە لە دەروونمدا كامڵیی و ناتەواویش هەیە. ئەوەش دەزانم كە گومان و هەڵەی زۆر دەكەم و دەشمەوێت دوور كەومەوە لەو گومان و هەڵەیە پێكەوە. بەدڵنیاییەوە ئەوە ناگونجێت كە هۆكاری "بوون"ی من ئەوە بێت كە بیر دەكاتەوە لە كائینێكی كامڵ و تەواو، بێتوو گەر ئەوە ڕاست بێت ئەوا دەتوانم ئەو (كامڵیانە) بەدەست بێنم كە وێنایان دەكەم لە خوادا و ئەوەش دەزانم كە دەروونم خاڵیە لەو كامڵیانە و هەزارە لە بارەیانەوە(٤٩) بوونم ئەو سەپاندنە بوو كە بەسەر (هیچ) دا درا و منی لێوە

دەرچووی، وە ئەو دەرچوونەشم لە (هیچ)ەوە ئەنجامی ئەو سەپاندنە بوو كە هێز و توانایەكی ڕەها و بێكۆتایی بڕیاری لێدا بووی، بۆیە ناكرێ بێلایەن و دوورە پەرێز بم لێی، پاشان من جەوهەرێكی (ناوەڕۆكێكی) بیركەرەوەم (بیرمەندم) ئەگەر ئەوە بم كە بوونم بەخشیبێت بەدەروونی خۆم بۆچی ئەبێ لەو بەخشینە دا چەند سیفات و تەواوكاریەك مابێت لە كۆتایی ئەو پێبەخشینەدا هیچیتر نەبن جگە لە تەنها ڕێگری و ئاستەنگی نەبێت بۆ ناوەڕۆكی ئەو جەوهەرە.

مادام خۆم نەبوومە هۆكاری بوونم كەواتە توێژینەوە پێویستە لەبارەی ئەو هۆكارەوە، ئەگەر نەگونجێت و نەتوانم بوونم بسەلمێنم یان بەبێهۆكار بمێنێتەوە. من بوونم هەیە لە (كات)دا و ئەو بوونەشم لەكاتدا پێك هاتووە لەو چركە ساتە یەك لە دوای یەكانەی كە هەر یەكەیان دابڕاوە لەوەی تریان. بوونم لەو چركەساتە ئامادەیە دا دەكرێ نەیەتە دی(ڕوو نەدات)، ئەویش ئەوەیە كە بە پێی پێویست چاودێری بوونم ناكەم لە چركەساتی دوای ئەودا. ناگونجێت كە باوكم هۆكاری بوونی من بێت. چونكە دایك و باوكم تەنها دوو پێكەوە گونجاوی یەكن بۆ لەدایك بوونم و لەتوانایاندا نیە چركەیەك دوام خەن لەو لەدایك بوونەی كە تێیدا لەدایك دەبم. پاشان هیچ سود و كەڵكێك نیە لە توێژینەوە لەبارەی بوونیانەوە و زنجیرەدانان لەم توێژینەوەیەدا، بەڵكو پێویستە دەست لەو توێژینەوەیە هەڵگرم كە لەبارەی بوونی منەوەیە ئێستا. من ئێستا هەم. ئەوەش دەزانم كە خۆم هۆكاری بوونی خۆم نیم و یەكەمین هۆكاری مانەوەی خۆشم نیم لە بوون و گواستنەوەم لە چركەساتی ئامادەوە بۆ چركەساتی دوای ئەو، لەسەر ئەم پێودانگە ئەو هۆكاری گواستنەوەیەش كە لەچركەساتی ڕابردووەوە بۆ چركەساتی ئامادە ڕوو دەدات

من نیم. هەر دەبێ هۆكارێك هەبێت! دەكرێ ئەم هۆكارەش هۆكاری خودی بوون خۆی و مانەوەی بێت لەو بوونەدا پێكەوە، یان بەگوێرەی دەربڕینی دیكارت و ماماۆستاكان دەشێ هۆكارەكە خودی خۆی بێت.

ئەمە ئەو كائینە كاملەیە كە من بیری لێ دەكەمەوە. من وێنای دەكەم كە ئەو هۆكارە دەوڵەمەند و بەهێز و توانا و دەسەڵاتدار بێت بەشێوەیەك گەر هەژار بێت لەبوونیدا ناتوانێت هۆیەك بێت بۆ بوون، وە ناشتوانێت بەلاوازی بمێنێتەوە لە بوونی خودی خۆیدا. دووبارە هەر ئەو تواناداری و پارێزگاری كەرە - جیاوازی لەنێوان ئەم دووانە دا نیە - بەوەی كە من كائینێكی دابڕاو و لاواز بم وە بەوەش كە ئەو دابڕان و لاوازیەم وا بكات لە بوونی دەروونم لە چركەساتی ئامادەدا داببڕێت لە چركەساتی یەكەم ( رابردوو ) و نەتوانێت پارێزگاری لەو بوونەی بكات.

ئەمە شێوەی دووەمی ئەو سەلماندنە بوو لەسەر بوونی خوا. ئەمیش وەك بەڵگەی یەكەم ڕاوەستاوە لەسەر هەر دوو دڵنیاییەكەی بەڵگەی یەكەم كە ئەوانیش بریتین لە : دڵنیایی لەبوونی دەروونی خۆم و لەو تەواوی و ناتەواویەش كە لەدەروونمدا هەیە لەڕاستی و هەڵە و لە بوون و نەبوون. وە دەكرێ دووبارە ئەمە لەگەڵ ئەوەی شێوەی یەكەمدا كۆ كەینەوە لەیەك تەعبیر و دەربڕینی پوخت و كورتكراوەدا.

دیكارت لەسەرەتای "*تێڕامانی چوارەم*" دا دەڵێت: تەنها لەمەدایە كە ( فیكرەی خوا ) لە دەروونمدایە، و بەوەی كە من بوونم هەیە كەواتە من ئەوەم وا ئەم فیكرەیەم تیایە و بوونی خوای لێوە هەڵدەهێنجم لەدڵنیاییەكی تەواودا.( ٥٠ )

بەڵگەی سێهەم: پاش ئەوەی سەلماندنی بوونی خوا تەواو بوو كەواتە سەلماندنی بوونی جەستەكان دەبێتە حاڵەتێكی گونجاو. بەڵام دیكارت مانەوەی بەچاك زانی لەگەڵ ئەو مانەوەیە دا كە دەتوانرێت بهێڵرێتەوە لە زەمینەی فیكرێكی جێگیری وا دا كە تێڕامان بكات لەوەی بەڕونی دەیزانێ و جیاوازی بەدی دەكات لە بارەی سروشتی ئەو جەستانەوە، ئەمەش لە پێش مل كەچ بوونی دەبێت لەسەلماندنی بوونیدا. ( ٥١ ) زانیاری ڕوون و ئاشكرا و جیاكراوە لەبارەی جەستەكانەوە بێگومان بریتییە لە زانیاری بیركاری. هیچ شتێك نیە گونجاو و شیاو بێت بۆ تێڕامان و زیاتر سەلماندن و دڵنیایی دەستەبەر بكات پاش دەروون و خوا جگە لە زانست و زانیاری بیركاری و حەقیقەتەكانی.

دیكارت ئەوەی بۆ دەركەوت كە دەتوانرێ ئەوە بهێنرێتە دی لەم بیركردنەوەیە لەزانستی بیركاری و حەقیقەتەكانی بۆ حەقیقەتێكی بەرز و بڵند لەخودی زانستی بیركاری بۆ حەقیقەتێك كە لەوانەیە ئەوە ئەسڵی دڵنیایی و بنچینەكەی بێت. مرۆڤ دەتوانێت پێشكەوتن بەدەست بێنێت لەم زانستەدا هێندەی بتوانێت تێیدا پێشكەوێت، بە پشت بەستن لە پێشكەوتنەكەیدا لەسەر وریاییەكی دانەبڕاو بۆ ئەو بڕیار و فەرمانانەی كە پێی هەڵدەستێت و لەسەر یاسایەكی وا كە چاودێری بكات لەنێوان گواستنەوەكەی و پێشكەوتنەكەیدا، هەروەها بەجۆرێكی تایبەت پشت بەستنی دەكەوێتەسەر ئەو بیر و بۆچوونە بیركاریانەی كە بڕیارەكان ئیشی تێدا دەكەن. فیكرەی بیركاری ڕوانینی دەروونێكی ڕەختە لە سروشتێكی جێگیركراوی حەقیقیدا وەك سروشتی سێگۆشە یان بازنە یان چوارگۆشە یان ئەو شتانەی وەك ئەمانەن. وەك سەرنج دەدەین دەبینین كە دەروون هیچی

پێناکرێت لەبەرامبەر ئەم سروشتانەدا تەنها سەیر کردن و چاوی زەینی نەبێت (چاوی عەقڵ) کە تەماشای پێدەکات و پاشان بڕیار و تۆمارکردن ئەنجام دەدات. بۆ نموونە لەسێگۆشە دا تایبە تمەندی دیاریکراو هەیە کاتێك عەقڵ و ئاوەز سەیری دەکات ئەو پەیوەندیانە دەناسێتەوە کەلە نێوان تایبە تمەندێتیەکاندا هەیە، لەسایەی ئەمەشەوە دەتوانێت بگوازێتەوە لەم تایبە تمەندێتیتەوە بۆ یەکێکی‌تر و لەمیشەوە بۆ یەکێکی‌تر.

هەروەها بەم شێوەیە حاڵەتەکە دەڕوات لەوەی کە پەیوەندداره بە بازنەوە و بەئەوانی‌تریشەوە لە سروشتە بیرکاریەکان: تایبە تمەندێتیە پێکەوە بەستراوەکان و بوونی ئەو پێکەوە بەستنە پێویستە یان وا دەکات کە هەموو سروشتێك کاری لەسەر بکەن و فیکرەش هیچی لەتوانا دا نیە لەبەرامبەر(٥٢) ئەو سروشتە و ئەو پێویستیەدا تەنها ئەوە نەبێت کەبڕیاریان لێدەدات و پاشان بەکاریان دێنێت لە پێشکەوتنە زانستیە دانەبڕاوەکانیدا.

دیکارت وای دەبینی کە دەشێ بیرکردنەوە لەخوا و لەبابەتی بوونی لەسەر ئاراستەیەکی هاوشێوەی بیرکردنەوەی بیرکاری بێت، گەیشتە ئاکام و تەواوکردنی ئەو بیرکردنەوە بۆ دڵنیایی هاوشێوەی دڵنیایی بیرکاریە، هەروەك چۆن فیکرەی سێگۆشە بەوە تەواو دەکرێت کە بڕیار بدەین لەوەی وا کۆی گۆشەکانی یەکسانە بەدوو گۆشەی وەستاو، هەروەها فیکرەی کائینێکی کامڵیش بەوە تەواو دەبێت کە (بوون ببێتە هۆکاری پێویست بوونی) وە فیکرەی کائینی کامڵ و تەواو بریتیە لە فیکرەی ئەو کائینەی کە هەموو کامڵیەکانی تێدایە. هەروەها ئەم کائینە کامڵی تەواوی نیە تاوەکو بوون بڕیاری تێدا نەبێت. کەواتە کائینی کامڵ و تەواو بوونی هەیە.(٥٣)

ئەم بەڵگەیە لەسەر بوونی خوا ناسراوە بە بەڵگەی بوونگەرایی( الوجودی ) لە بەر ئەوەی فیکر تێیدا ڕاستەوخۆ دەگوازێتەوە بۆ بوونی خوا. وە گوێزانەوەی ئەم فیکرە بۆ بوون ئەوەیە کە وای کردووە لەو بەڵگەیە ببینێتە جێگای گفت و گۆ و موجادەلە و ڕەخنە و ناڕەزایی لەکاتی ژیانی دیکارت و پاش مردنیشی. ئەی ئێستا ئەبێ لە پاساوهێنانەوەی ئەو بەڵگەیەدا چۆن پشت ببەسترێت بە نموونەکانی زانستی بیرکاری کە بۆ تەنها چرکەیەکیش فیکر لێی ناچێتە دەرەوە بۆ بوون؟

هەڵدەستین بەبەراوردکردنی فیکرەی کائینی کامڵ و بیر وبۆچوونە بیرکاریەکان لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەموو ئەم بیر و بۆچوونانە بە فیکرەی کائینی کامڵیشەوە بریتین لە بیر و بۆچوونەکانی سروشتە جێگیرە ڕاستەقینەکان. ڕەخنەگرتن و ناڕەزاییەکان بەرامبەر دیکارت لەسەر ئەم بەڵگەیەی پێشوو بێگومان لەو دەرك نەکردنەیانەوە سەری هەڵداوە کە نەیان بووە بۆ ئەم بەراورد کردنەی باسمان کرد و هەروەها بەهۆی تێنگەیشتنیانەوە بووە لە بیردۆزەکە لەبارەی بیر و بۆچوونەکان و سروشتە جێگیرە ڕاستەقینەکان. بیر و بۆچوونە ( هزرە ) بیرکاریەکان و فیکرەی کائینی کامڵ هەموویان بیر و بۆچوونەکانی سروشتە جێگیرە ڕاستەقینەکانن یان ئەو سروشتانەن کە هەر یەکەیان جیا دەکرێتەوە بە پێویستیەکی ناوخۆیی دیاریکراو. وە هەموو هزرێکی بیرکاری جیا دەکرێتەوە لە یەکێکیتر بەهۆی سروشتەکەیەوە، بۆ هەر یەکەشیان سروشتێك و پێویست بوونێکی تایبەتی هەیە. هەروەها هزری ( فیکرە )ی کائینی کامڵیش فیکرەیەکی جێگیری ڕاستەقینەیە و بۆ ئەم سروشتەش پێویست بونێکی تایبە تمەندی دیاری کراو هەیە کەجیایدەکاتەوە لە سروشتە بیرکاریەکان. بێتوو گەر بەدڵنیاییەوە ئەو

فیکرەمان لا بێت کە دەربارەی کائینێکی کاملە ئەوە پرسیارێك قووت دەبێتەوە دەربارەی جیاکردنەوەی ئەو فیکرەیە یان دەربارەی جیاکردنەوەی ئەو ( سروشت و پێویست بوون )ەی ئەم کائینە کاملە کە فیکرەمان هەیە لە بارەیەوە، وە دەربارەی ئەو سروشتە بیرکاریانەی کە لەبارەی هەر یەکەیانەوە فیکرەیەکی ئاشکرا و جیاکراوەمان هەیە. ئەمەش پرسیارەکەیە دەڵێ: فیکرەی کائینی کامڵ بەچی جیا دەکرێتەوە لەو بیر و بۆچوونانەی تر؟ وەڵام: جیاکردنەوەی ئەم لەوانیتر لەوەدایە کە فیکرەی کائینی کامڵ ماهیەتی دابڕانی نیە لە گەڵ بوونیدا واتە فیکرەی کائینی کامڵ ماهیەتەکەی تەواوکەری بوونەکەیەتی،( ٥٤ ) لەکاتێکدا ئەم تەواوکردنە لەهیچ فیکرەیەك لە فیکرەکانیتر دا نیە و بەدی ناکرێت. فیکرەی کائینی کامڵ بەتاکی و بێوێنەییەکەی جیا دەکرێتەوە و دەناسرێتەوە لەنێوان فیکرەکانیتر دا،( ٥٥ ) هەروەکو چۆن بیرۆکەی ( هزری ) سێگۆشە جیا دەکرێتەوە و دەناسرێتەوە لە بیرۆکەی بازنە و لەبیرۆکەی چوارگۆشە، بۆ فیکرەی کائینی کامڵ ئەو پێویست بوونە خۆی دەسە پێنێت بەسەرماندا کە بڕیار لە بوونی بابەتەکەی بدەین، هەروەك چۆن لە فیکرەی سێگۆشە دا پێویست بوون سە پاندی بەسەرماندا کە بڕیار بدەین بۆ سێگۆشە کۆی گۆشەکانی یان کۆی پلەکانی هەر سێ گۆشەکەی یەکسانە بە کۆی پلەکانی دوو گۆشەی وەستاو. هەروەك ئەوەی ئەگەر هاتوو بیرمان کردەوە لەسێگۆشە ئەوا ئەبێ یەکسەر بێدوودڵی ئەوە بزانین کە کۆی گۆشەکانی یەکسانە بەکۆی دوو گۆشەی وەستاو، هەروەها بەم شێوەیە هەموو جارێك ئەگەر هاتوو بیرمان کردەوە لە کائینی کامڵ ئەوا پێویستە لەسەرمان کە دان بنێین بە بوونیدا، مادام حاڵەتەکە بەم ئاقارەدا بڕوات و ئەم بیرکردنەوەیە لە کائینی کامڵ وێنەیەکی چەسپێنراوی ئەسڵی وەك خۆی بێت بۆ

ئەم كائینـە و یەكـەمین شـوێنەواری لەدەروونـدا هـیچ ناسـڕێتەوە لەسروشت و پێویست بوونەكەی، ئەگەر ئیتر بڕیار و حاڵەتەكە بەم جۆرە بێت ئـەوا بۆمـان دەردەكەوێت تەنها یەك بەڵگە و سەلماندن یـان (تـاكێتی بەڵگـەی سـەلمێنراو) هەیـە لەسـەر بـوونی خـوا كەئـەوەش لـە كۆتـایی ئـەم بڕیـار و حاڵەتـەدا پیشاندانی شێوەی یەك بەڵگەییە.

## ديكارت و بوونی جيهان:

دیكارت سەرنجی ئەوەی دەدا پاش ئەوەی كە دەیزانی بوونی هەیە و خواش بوونێكی دڵنیاییكەر و تەواوی هەیە و كەواتە دووبارە ئـەبێ ئـەویش هـەبێت. بـەو مانایـەی دەروونێكـی جیـاكراوەی هەیـە لـە جەسـتە كـە توانـای هەیـە بمێنێتەوە بە بێبوونی جەستەش بە زیندوویی و نەمری. پاشان بیری بـۆ ئـەوە چوو مادام كە خوا هەبێت و ئەمیش دڵنیاییەكی تەواوی هەبێت بە بوونی خـوا و شوێنێكی بەرز و بڵندی هەبێت لە دڵی ئەمدا، یان بەجۆرێكیتر لای دیكارت بە بێبوونی خوا وا حساب بۆ خۆی دەكات كە زیندانیەكە و ماوەتەوە لە "كۆجیتۆ" دا بەدەست بەسەری و هەرگیز لێی نایەتـە دەرەوە، هـەروەها بـەبێبوونی خـوا تەنها هەر خۆی دەناسێت و هیچ شتێكیتر ناناسێت. بـەڵام بـوونی خـوا زامـن كـەری هـەموو زانسـتێك و هـەموو دڵنیـا بوونێكـە، وە بـەهۆی بـوونی ئـەوەوە دەتوانرێت پەڕینەوە بەسەر ئەو چاڵی گومانـەدا دەستەبەر بكرێـت كـە گومـان هەڵی كەندووە لەنێوان فیكر و شتەكانیتردا و ئەو كاتـە دەتوانرێـت دڵنیـایی تەواو بەدەست بهێنرێت بۆ بوونی جیهـانێكی دەرەكـی. ئـەو ئـارەزووە سروشـتیە

بەهێزەی دیكارت هەستی پێدەكرد و بانگەشەی پێدەكرد بۆ بڕواهێنان بە بوونی ئەو جیهانە، ئەو ئارەزووە بوو كە مەحاڵە ببێتە پێشەنگی تاریكی و سەرلێتێكچوونی دیكارت، ئەویش لەبەر ئەوەی دیكارت سوودمەند بوو بوو لەو خوایەی كە هەر ئەو كاملّ و ڕاستگۆ و فرو فێڵ نەكەرە.

وە هەر لەو ساتەوەختەی كە دیكارت خوای تیا دۆزیەوە و پێی ئاشنا بوو ئیتر دڵنیایی تەواوی وەرگرت لەبوونی شتەكان و گومانیش لای بوو بەشتێكی مەحاڵ و هەرچی دوودڵی و ڕاڕایی هەبوو فڕێی دا و لەجێگەیدا بڕوابوون بەعەقڵ و دڵنیایی مۆلەق نەبوو بنجی داكوتا.

دیكارت دەڵێ: ئەتوانم سیقەم بەو ئەنجام و ئاكامانە هەبێت كە بەڵگەكاری و ڕێبەرایەتی كردنی عەقلیی پێشەنگ كاری و سەرپەرشتی تیا كردبێت هەر چەندە چارەنووسێكی دوور و درێژ و ئاڵۆزیشی هاتبێتە بەردەم تەنها لەبەر ئەوەی ڕەچاوی یەك مەرجی تێدا دەكەم و چاودێرم لەسەری: بەوەی كە بۆ من فیكرەیەكی ڕوون و ئاشكرا و جیاكراوەیە لە هەر زنجیرەیەك لەزنجیرەكانی سەلماندن و بەڵگەكاری، لەوانەیە جار و بار وا ڕوو بدات لە توێژینەوەكانمدا لە ڕێ لا دەم بەلام لەو كاتەدا من تەنها بەرپرسیاری خۆمم: لەبەر ئەوی ئازادم، ویست و توانام بێكۆتاییە، دەشگونجێ ویست و ئیرادەم پەلە بكات لەبڕیاردان بەسەر شتەكاندا پێش ئەوەی عەقلم بیان بینێت بەڕوون و ئاشكرا و جیاكراوەیی. گەر خوا ئازادی پێ بەخشیوم ئەوا دەست نیشانكردنیش هێز و توانای پێبەخشیوم لەسەر ڕاست و هەڵە.

بوونی خواش ئەو بوونەیە كە زامنی بوونی جیهانێكی دەرەكی دەكات. بەلام جیهانی دەرەوە( ٥٦ ) ناگونجێ بوونێكی ڕاستەقینەی وای هەبێت لەسەر ئەو شێوازەی وا ئێمە دەیناسینەوە بەهەستەكانمان، چونكە هەستكردنەكان

دەشێ ئەو بیروبۆچوونە شاراوە و نادیارانە بن کە ئەبنە هۆی بەدیهێنانی ئەو دڵنیاییانەی کە مەبەستمانە، هەروەها ناتوانین بەهەستکردنەکانمان هیچ دڵنیاییەك بەدەست بێنین بۆ نموونە لەبارەی سروشتی ڕوناکی یان سروشتی دەنگەوە. زامن بوونی خوایی بەسوودە لەو ڕاستیەدا کە حەقیقەتێك دەدۆزرێتەوە دەشێ ئەو بابەتێك بێت بۆ بیرۆکەیەکی ڕوون و جیاکراوە.

گەر دیقەت بدەین و لێکۆڵینەوە بکەین لەسەر وێناکردنەکانمان بۆ جیهانی دەرەکی ئەوا هیچ بەدی ناکەین تەنها بوونی یەك فیکرەی جیاکراوەی هەمیشەیی نەبێت هەرچەندە سیفاتە هەستاوەریەکانیش گۆڕانیان بەسەردا بێت: ئەو فیکرەیش بریتیە لەدرێژبوونەوە (کشان) کە ئەمەش بابەتی لێتوێژینەوەی ئەوانەیە کەسەرقاڵن بە ئەندازەوە، ئێستا دەتوانین کە بنەمای بیرو بۆچوونە ڕوون و ئاشکرا و جیاکراوەکان وەرگرین وەك هۆکارێك تا بەهۆیەوە بتوانین ئەو بڕیارانە دەرکەین لەسەر بوونی جیهانێکی ماددی و سروشتەکەی. گەر هاتوو گەیشتین بەجەستەیەك جا ئەو جەستەیە هەرچیەك بێت تەنها ئەوە بەسە کە پرسیار لەخۆمان بکەین لە بارەیەوە: لەبارەی چ شتێکەوە فیکرەیەکی ڕوون و جیاکراوەمان دەبێت لەکاتێکدا کە بیر لەو جەستەیە بکەینەوە؟

بۆ نموونە پارچەیەك لە (مێوی) مۆمی هەنگوین وەردەگرین کە پاش دەرهێنانی لەشانەکە ماوەیەکی کەمی بەسەر دا تێپەڕی بێت: دەبینین ئەو پارچەیە مێوە شیرینی هەنگوینەکەی لە دەست نەداوە کە تیایدا بووە و بۆن و بەرامەی ئەو گوڵانەی تیا ماوە کە شیلەیان بەخشیوە بەهەنگەکان، ڕەنگ و شێوە و بارستاییەکەی ئەو شتانەن کە دیارن و بەچاو دەبینرێن، ئێستا ئەو پارچە مۆمە ساردە و بەستوویەتی و دەتوانرێت دەستی لێبدرێت و ئەگەر

بشتەوێ کەمێکی لێ بقرتێنی ئەوا گوێت لە جۆرە دەنگێك دەبێت لێوەی لە ئە نجامی ئەو قرتاندنەدا ( لێکردنەوەیە دا ). لەکۆتاییدا هەموو ئەو شتانەمان بەدی کرد لەو پارچە مۆمە دا کە دەبنە هۆی ناسینەوە و جیاکردنەوەی هەمان پارچە لە کاتێکدا بمانەوێت جەستەکەی پێ بناسینەوە. بەلاّم لەنزیك ئاگرێکەوە دامناوە و خۆشم خەریکی قسەکردنم ئایا چی دەبینم؟ دەبینم پاشماوەی ئەو چێژەی کە تیایدا بوو ڕۆشتووە، بۆن و بەرامەشی نەماوە، ڕەنگەکەشی گۆڕاوە، شکڵ و شێوەکەشی ون کردوە، بارستایی و قەبارەشی زیادی کردووە، بەتەواوی گۆڕاوە بۆ شلەمەنی، هەروەها بەجۆرێك گەرم بووە کە توانای دەست پێوەدانی زەحمەتە، وە هەرچەندە بمانەوێت پارچەیەکی لێ بکەینەوە ئەوا بەهیچ جۆرێك دەنگی لێوە دەرناچێت. بەلاّم مادەی مۆمەکە هەر ماوەتەوە پاش ئەم هەموو گۆڕانکاریانە؟ پێویستە بڕیاری ئەوە بدەین کە ماوەتەوە و کەسیش ناتوانێت سەرپێچی لەمە بکات. ئێستا چی دەزانین لەبارەی ناسینەوەی ئەم پارچە مۆمەوە تا بەڕوون و ئاشکرایی جیای بکەینەوە و بیناسینەوە؟

بەدڵنیاییەوە هیچ شتێك نیە کە بتوانین لەڕێگەی هەستەوە لەو هەموو جیاکردنەوانەی پێشەوەی بینیمان تا بەهۆیانەوە بیان ناسینەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە هەموو ئەو شتانە کەوتوونەتە ژێر هەست پێکردنەکانی چێژ یان بۆن یان بینین یان بەرکەوتن یان بیستنەوە، بۆیە هەموویان گۆڕانکاریان بەسەرداهاتووە و لەکاتێکدا تەنها هەر ماددەی مۆمەکە خۆی ماوەتەوە.( ٥٧ )

لەم دەرئە نجامە شیکاریەوە بۆ ئەو نموونانە، دیکارت ئەوەی لا گەلاّلە بوو کە ئەو مۆمە ئەو بۆنە نەبووە، هەروەها ئەو ڕەنگەش نەبووە، ئەو بەرگریکردنەش نەبووە، ئەو شکڵ و شێوەیەش نەبووە کە هەستەکان دەرکی

پێبکەن لەسروشت و قەوارەی خۆیاندا، من خۆشم لە توانامدا نیە بەئەندێشەو خەیاڵ تێبگەم لەوەی بزانم کامەیە ئەو پارچە مۆمە، بەلام تەنها زیهنم هەر خۆی دەتوانێت لەوە تێبگات و هەر ئەویش توانای بەسەر ئەوەدا دەشکێت کە بەهەمیشەیی سۆراخی بکات. هەر چەندە ئەو مۆمە بسووتێت و بتوێتەوە و پەرش و بلاو بێتەوە ئەوا زەین هەمیشە پەیوەندی پێوە دەکات و ئامادەیە لەسەری لە هەر بارودۆخێکدا بێت.

مۆمە تواوەکە ماوەتەوە و لەبەر چاوە بەلام ئەوانەی لێ دامالراوە کە بەهۆی هەستەکانی چێژ و بۆن و بەرکەوتن وبیستنەوە هەستمان پێدەکرد.

ئەوەی ماوەتەوە لەمۆمەکە و زیهن دەرکی پێدەکات بەڕوون و ئاشکرایی و جیاکراوەیی بریتیە لەکشانەکەی (درێژبوونەوەکەی). ئەو کشانە کشانێکی هەستاوەری نیە کەبتوانم نمایشی بکەم بەهۆی هەستەکان و ئەندێشە و خەیالمەوە، بەلکو ئەوە تەنها کشانێکی زیهنی و دامالراوە لەهەموو ڕەنگ و دەنگ و بەرکەوتنەکان.

بەم پێیەش کشان (درێژبوونەوە) نابێتە ماهیەتی مۆمەکە لەسەر ئەو شێوازەی بینیمان لەشیکردنەوەکەی پێشوودا، بەلکو جەستە (تەن) و ماددەش شتێك نین کە زیهن دەرکیان پێ بکات جگەتەنها لەم (کشانە تاك و تەنها)یە نەبێت کە ئەوەش دەچوێنرێت بە بۆشاییەکی خاوەن ئەندازە. کەواتە کشان بە تەنها خۆی "سیفەتی یەکەمە" کە ئەمەش جەوهەری جەستەی سەربەخۆیە لە جەوهەری دەروون. بەلام ڕەنگ و دەنگ و بۆن و چێژەکان هەموویان سیفاتی دووەمن و بوونیان نیە لە خودی خۆیاندا بەلکو بوونیان لەناو زیهنماندایە.

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئێمە "جیهانی دەرەکی" ناناسین بەناسینێکی ڕاستەوخۆ بە هۆی هەستەکانەوە، هەروەها دەرکیشی پێ ناکەین

بە دەرك پێكردنێكی ڕاستەوخۆ وەك ئەوەی كە لەخودی خۆیدا هەیە، وە هەموو ئەو شتانەی كە لە بارەیەوە دەیزانین و دەیناسین هەموو ئەو وێناكردنە زەینیانە و بیر و بۆچوونانەن كە لەناو زیهنماندایە.

بەلام ئەم وێناكردن و بیر وبۆچوونانە كتومت چەسپێنراوی بوونە ڕاستەقینەكانن و خەیالی نین، ئەمەش ئەوەیە كە ئێمە پێی نازانین تەنها بەهۆی ناوەندێك یان هۆكارێكەوە نەبێت یان ڕاستتر بلێین ئەویش لەسایەی ڕاستگۆیی خواییەوەیە:

چونكە ناگونجێت ئەو بیر و بۆچوونانە بە هەلەماندا بەرن كە خوا بەخشیویە پێمان لەگەل ئەو ئارەزووە بەهێزەی كە هەمانە بۆ بڕوا بوون بەوەی كە ئەو بیرو بۆچوونانەمان ڕاست و دروستن. لەماوەی لێكۆلینەوەماندا بۆ بیر و ڕاكانی دیكارت تێبینی ئەم حالەتەشمان كردووە لە (بوونی دەروون وەك كائینێك لەزەمەندا و هۆشیاری ڕاستەوخۆ بەو بوونە زەمەنیە). ئەمەش بریتیە لە دیاردەی بوونی زەمەنی دەروونی. ئەو بەلگەیەش كە لەسەربوونی "خوا"یە لەسەر ئەم دیاردەیە دەوەستێت. ئەمەش بەو مانایە دێت كە تیۆری "خولقاندنی بەردەوام" و بەرجەستەكردنیەتی لەنێوان ئەو شتانەی پەیوەندیان بە دەروونەوە هەیە. دیكارت ئەم وێنەیەی خستۆتە ڕوو لەكتێبی "*ڕامانەكان*"دا. هەر چەندە پێش ئەمەش لە وێنەیەكی گشتیدا پیشانی داوە بەلام دەربارەی جیهانێكی ماددی و هەروەها دەربارەی هەموو فەلسەفەی سروشت، هەروەها لەكتێبی "*جیهان*" و پاشان لەكتێبی "*وتارێك دەربارەی میتۆد*" تێیاندا هاتووە و بڕیار لەوە دەدات كە خوا پارێزگاری جیهان دەكات لەبووندا، لەسەر هەمان ئاڕاستەی كە ئەوی لەسەر دروست كراوە، وە ئەو كردارەشی كە جیهانی پێ دەپارێزرێت جیاوازی نیە لەگەل ئەوەی كە ئەوی پێ

دروست كراوە.( ٥٨ ) هەروەها ئەو هێز و توانایەی كە بۆ یەكەمین جار دروستی كردوە پێویستە سەر لەنوێ بسە پێنرێتەوە لەهەر چركەساتێك لە چركەساتەكانی بووندا.( ٥٩ )

دیكارت ئەم چەمكانەی بەرجەستە كرد لەبواری جیهانی ماددیدا، لەو بوارەدا ئاماژەی تێدا ناكرێت بۆ بەڵگە لەسەر بوونی خوا بەو مانایەی كە پێویستی نیە بەبەڵگە هێنانەوە، یان بەو مانایەی كە ڕاستەوخۆ دەگوازرێتەوە لەسیفەتی ڕوودانی زەمەنی لەجیهاندا بۆ جێگیربوون بەوەی كە جیهان دروست كراوە بەبوونی دروستكەرێك ( خالقێك )، هەر وەك چۆن ڕاستەوخۆ دەگوازرێتەوە لەدیاردەی بوونی زەمەنی دەروونیەوە بۆ سەلماندنی خوای بەدیهێنەر.

ڕوون و ئاشكرایە كە بۆ تیۆری خوڵقاندن ئەمە ئەنجامێكی میتافیزیكی لاهوتی ڕاستەوخۆیە. بەوەی خوا جیهانی خوڵقاندووە بەخوڵقاندنێكی بەردەوام و پارێزگاریشی كردوەو هەروەك چۆن دروستی كردووە، كەواتە بەشێوەیەكی بەرە بەرە دروستی نەكردووە كە بگوازێتەوە لەشێوە سادەكانەوە بۆ شتە ئاڵۆز و قورسەكان و لەمەشدا پشت ببەستێت بەكات و گۆڕانی كات. بەڵكو لە بنەڕەتدا دروستی كردوە لەسەر ئەو شێوەیەی كە ئێستا لە بەرچاومانە و دەیبینین.( ٦٠ ) كتێبە ئاسمانیەكانیش باس لەمە دەكەن دەربارەی ئادەم و ئەو بەهەشتەی كە تێیدا ژیاوە، ئاماژە بۆ ئەوەش كراوە كە خوا مرۆڤی دروستكردوە لەگەڵ هەموو گیانلەبەرەكان و دروستكراوەكانیتری جیهاندا لەشێوەیەكی كامڵ و تەواودا.

جێگای سەرنجە كە ئەم مانا لاهوتیە میتافیزیكیە بۆ خوڵقاندن تێدەپەڕێت لە چەمكە مرۆڤایەتیەكانی ئێمە، بەڵام هەر دەبێ فەیلەسوف باسی ئەو پەیوەندیەی نێوان حەقیقەتی خوڵقاندن و سروشتی زانست و

چەسپاندنە كرداریە دروستكراوەكانیمان بۆ بكات. تێبینی ئەوەشمان كرد كە پرۆژەی دیكارت لە زانست و جیهانی ماددیدا لەڕووی جێبەجێكردنەوە دانابڕێت لە زانست، ئەوەشمان دی كە بەرنامە ( پرۆگرام ) لەمەبەست و ئامانجی ئەو دا ئاراستە كراوە بۆ ئەو جێبەجێ كردنە، لەبەر رۆشنایی ئەو مەبەستانە دا ڕێگاخۆش دەبێت بۆ زانستە بیركاریەكان و شێوازی شیكردنەوە یان هەروەك چۆن ڕێگا خۆش ددبێت بۆ زانستە سروشتیەكان لە شێوەی میكانیكی ئەندازەییاندا.( ٦١ )

گومان دڵی دیكارتی پیس نەكرد بۆ تەنها چركەیەكیش لە جێبەجێكردنی ئەم پرۆژە زانستیەدا، نە لەقۆناغی بەرنامەڕێژیدا و نە پێش ئەو كارتێكردنەی مەسەلەی خولقاندنیش لە ڕووی ڕاستیە زانستیەكانەوە، نە لە قۆناغی زانستی دوای ئەوەش بۆ هەڵوێستی لە خولقاندنی ڕاستیە زانستیەكان، نە لەهەر دوو قۆناغی فەلسەفی و ئەخلاقیشدا، بەوەی كە ئاماژەی پێداوە لەكتێبی *"بنەماكانی فەلسەفە"* دا و دەڵێ لقە سەرەكیەكانی دەرەختی فەلسەفە بریتیە لە میكانیك و پزیشكی و ئەخلاق.( ٦٢ )

ئەو پرۆژەیەی دیكارت داینا لە بارەی پرۆگرام و زانستەوە بوو بەهۆی بەدیهێنانی ئەو ئیعتیبارەی كە جیهانی سروشتی كشانێكی ئەندازەییە و جوڵانەوەكان تێیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گۆڕانكاریانەی دێت بەسەر بەشەكانی ئەو كشانەدا لە بارودۆخە ئاڵوگۆڕكراوەكاندا.

لەبارەی ئەم پرۆژەیەوە دیكارت لەكتێبەكەیدا بەناوی *"القواعد"* ئەمەی دەربڕیوە لەتیۆری "خولقاندنی ڕاستیەكان"دا، پاشان ڕوو دەكاتە تیۆری "خولقاندنی بەردەوام" كە دەیبەستێتەوە بە دەركەوتە زانستیە فیزیاییەكانەوە، تێیدا هەوڵی داوە كەبەڵگە بێنێتەوە لەسەر ڕونترین مانای

تایبەت بەبنەماکانی جیهانی ماددی و سەپاندنی وەسفێك بۆ ئەم جیهانە و بۆ دیاردەکانی کە لەسەر ئەو بنەمایانە وەستا بێت و بگونجێت لەگەڵ ئەو تیۆریە میتافیزیکیە لاهوتیەدا. دیکارت وای دەبینیەوە کە پێویستە لەسەر مرۆڤ پۆزش بێنێتەوە لەگۆشە نیگای ئەو پەیوەندییە کردارییە خواییە ڕەهایەی کە خواوەند هەیەتی بۆ خولقاندنی بەردەوامی ڕووداوە زەمەنیەکان، هەروەکو چۆن پێویستە مرۆڤ هەڵوەستە بکات لەسەر ئەو ڕووانەی (شێوانەی) کە لە توانایدایە بەهۆیانەوە سەرکردایەتی جیهان بکات و زاڵ بێت بەسەریدا.

دیکارت لەکتێبی "*جیهان*" دا وێناکردنی بۆ جیهان و گەشەسەندنی خۆی بەتەماشاچی و هاندەرێکی وا دەبینێتەوە کە هاندەر بێت لەسەر جیهانێکی نوێ جیاواز لەم جیهانەی ئێمە، جیهانێك کە شایانی ئەوە بێت خوا دروستکەری بێت و ڕەزامەندی لەسەر بێت، کە تێیدا حەقیقەتی بەردەوام و مانا ڕوونەکانی دەروونی تیا بەدی بکرێت، هەروەها گونجاو بێت و داخوازی ئیش و چەسپاندن و دروستکردنی تیا بێت.(٦٣)

دیکارت بەمانایەکی ڕوون و ئاشکرا لەبارەی بنەماکانی جیهانی ماددیەوە پیشانی داین، بینین وەك مانای کشان (درێژبوونەوە) نیە و ناشکەوێتە شوێن ئەو وێناکردنە ئەندازەییەی کە بۆ جوڵە و گۆڕانکاری جیهانی وێنای دەکات، بەلام ئەو وەسفەی کە دێت بەخەیاڵ و ئەندێشەیدا بریتیە لە وەسفی میکانیکی ئەندازەیی لەبەر ئەوەی ئەو ماددەیەی کە جیهان ئیشی تیا دەکات پێویستە ئەو تایبە تمەندێتیانەی تێدا نەسەپێنین کە تەنها بە چاو دەیانبینین لە جەستەکاندا (لە تەنەکاندا)، بەڵکو پێویستە لەسەر ئەو ئاراستەیە وێنای بکەین کە عەقلی سروشتی ڕوناك لێی تێدەگات و بڕیاری لێدەدات، ئەو عەقڵ و ئاوەزەی کە ڕێنوێنی کراوە بە بنەماکانی بیرکاری.

مادده کشانێکی ئەندازەییە شوێن پڕ دەکاتەوە و داگیری دەکات بەشێوەیەك کە هیچ بۆشاییەکی تێدا نەمێنێتەوە چونکە ناگونجێت پاساوی بۆ بهێنرێتەوە بەوەی کە خوا شتێ لەبەشە مادیەکانی خوڵقاندبێت لەشوێنێکدا و هیچی تری نەخوڵقاندبێت لەشوێنێکی تردا. ئێمە لەبەر دەم پڕکردنەوەیەکی ئەندازەیی ڕەها داین.(٦٤)

دیکارت ڕەچاوی ئەوەشی کردوە کە ناگونجێ هیچ شێوەیەك لەو شێوە جەوهەریە شاراوانەی کە مەکتەبلیەکان سەپاندوویانە بدرێتە پاڵ کشان (درێژبوونەوە)، یان هیچ ڕواڵەتێك لە ڕواڵەتەکانی هێز و کارایی بەو ئیعتیبارەی کە کشان بەستوویەتی بە هەموو چەق بەستنێك. گەر ئەمە ڕاست بێت مانای ئەوەیە جوڵە ماناکەی ناچێتە دەرەوە لە بەشەکانی کشان و لەگۆڕانی ئەو باروودۆخانەی کە لەنێوان بەشەکاندایە. لەبەر ئەوە ئەو یەکەمین بیر و باوەڕەی وا جیهان لەجوڵەی خۆیدا مل کەچیەتی دەبێتە بیر و باوەڕی کەمتەرخەمی خۆیی، یان بیر و باوەڕی چەق بەستوو.

ئەم بیر و باوەڕە ئەوەمان بۆ دەردەخات هەموو جەستەیەك دەمێنێتەوە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە لەسەریەتی و وازیشی لێ ناهێنێت تەنها لەکاتی لێك خشاندنیدا نەبێت لەگەڵ جەستەکانی (تەنەکانی)تر دا.(٦٥) ئەمەش بەو مانایە دێت کە جەستەی نیشتەجێ و نەبزۆك دەمێنێتەوە بە نەجوڵاویی و نەبزۆکی و جەستەی بزێویش دەمێنێتەوە بە بزێوی و جوڵەجوڵ گەر بەجوڵەیەکی ڕاست و ڕێکخراو، مادام گۆڕانکاری بەسەر دا نەیەت لە حاڵەتی نەبزۆکەوە بۆ حاڵەتی بزۆك بەهۆی لێك خشاندنیەوە لەگەڵ جەستەیەکی تردا.

لەم ڕوانگەیەوە خوا دەبێتە یەکەمین هۆکاری چالاك و کاریگەر بۆ جوڵە و ڕووداوەکان و گۆڕانکاری لەجیهاندا، وە هۆکاری لەبەرچاویش لێك خشاندنە. لێك خشاندنیش هۆکارێکی ناچالاك و ناکاریگەرە و گونجاو نیە لەگەڵ هێز و توانای خواییدا. بەلام لێك خشاندنیش بەرهەم هێنەری ئەو گۆڕانی جوڵەیەیە لە جیهاندا کە مەبەست لێ پێك گەیشتنی جەستەیە کە بەجەستەیەکیتر و ڕوودانی گۆڕانکاری لە ئەنجامی ئەم پێك گەیشتنە دا لەسەر ئاستێکی وا کە ئەو گۆڕانکارییە لەچرکەساتی لێك خشاندنەکەدا دەستبەجێ شوێنەواری دیار دەبێت و هەستی پێدەکرێت. یان ڕاستتر کرداری لێك خشاندنەکە وەستاوە لەسەر هەمان کات و ماوەی ئەو لێك خشاندنە و لێ تێنا پەڕێت، نابێت ماوەی لێك خشاندنەکەش زۆر بخایەنێت و ببێتە هۆی لەناوچوونی جەستەکان. لەسەر ئەم بنەمایە ئەو لێك خشاندنانەی کە دەبنە هۆی بەدیهێنانی گۆڕانکاری جیهانیی وەستاون لەسەر ماوەکان جا ئیتر ماوەکانیش بەدوای یەکدا بن یان دابڕاو بن لەیەك ئەوا بێبەری نین لەو هێز و توانا بالادەستەی کە ئەو لێك خشاندنانە پێکەوە گرێ دەدات و دەیانبەستێ بەیەکەوە بەجۆرێك کە وابزانی گۆڕانکارییەکی بەردەوام و دانەبڕاو ئەنجامی داوە و دەبێتە هۆی ڕاگرتنی جیهانێکی بەرهەم هاتوو لەڕووداوی بزۆك و نەسرەوتوو. نموونەش بۆ ئەمە جوڵەی تیشکە. چونکە تیشك دەست بەجێ سەیرکەر (تەماشاکەر) دەرکی پێدەکات و یەکسەر دەگوازرێتەوە بۆ چاو هەروەك چۆن جوڵەی (گۆچانێك ــ دارێك) لە لایەکەوە بۆ لایەکیتر دەگوازرێتەوە بۆ گوێزرانەوەیەکی کوت و پڕ و دەستبەجێ.

دیکارت ڕەچاوی ئەوەی دەکرد فەلسەفەی سروشت هەمووی هەرەس دێنێت بێتوو گەر ئەمە ڕاست بێت: کرداری تیشك (ڕوناکی) دواکەوێت لەکاتی

گواستنەوەیدا ئەمەش لەبەر ئەوە ڕوو دەدات چونکە دواکەوتن دەبێتە هۆی بەدیهێنانی لێك ترازان و دابڕانێك لە کشاندا یان بۆشایی دروست دەبێت یان نەبوویەکی ڕەها پێك دێت، ئەمەش ڕێگەی پێنادرێت لەلایەن هێز و توانای خواییەوە، ئەم هێز و توانایەش هێز و توانای خولقاندنی بەردەوامە. ئەو خولقاندنەش تێی پەڕاندووە لە عەقڵ و ئاوەزی بەشەری.

ئەمەش بەمانای دەست پێوەگرتنی یان پاراستنی جوڵە دێت بە ڕادەیەکی جێگیر و دیاریکراو کە گۆڕانی بەسەر دا نایەت لە هەموو چرکەساتەکانی جیهاندا، یان بریتیە لەو بنەمایەی کە ڕادەی جوڵە جێگیر دەکات. لەهەموو چرکەساتەکانی کاتدا هەر لە چرکەساتی جیهانی یەکەمەوە ئەو ئاستی جوڵەیەی کە خوا ڕێکی خستوە لەسەر جیهان شتێکە تایبەتە بەخۆی، لەسەر ئەم بنەمایە حاڵی جیهان لە چرکەساتێکی دیاریکراو دا دەبێت کە هاوتای ئەو حاڵەیە لە هەر چرکەساتێکیتر دا دێت بەدوایدا، هەموو گۆڕانێك لەو چرکەساتەدا وەك ئەو گۆڕانانەیتر وایە کە لە دوای ئەو چرکەساتەوە دێن و هەمووشیان بەهۆی لێك خشاندنە یەك لە دوای یەکەکانەوە ڕوو دەدەن بە بێ ئەوەی لەوێدا هیچ گۆڕانێك ڕوو بدات لەئاستی ( ڕادە )ی خودی جوڵەی جیهانی خۆیدا.

دیکارت ئاماژە دەکات بەیاساکانی لێك خشاندن کە ژمارەیان حەوتە، ( ٦٦ ) گۆڕانکاریە گەورەکان لەجیهاندا لەو یاسایانەوە سەر هەڵدەدات و گەشە دەکات. پاشان لەسایەی هەر دوو فیکرەی کشان و جوڵەی ئەندازەییەوە لەبەڵگەکاری بەردەوام بۆ یاساکانی جیهان و دیاردە گشتیەکان دەگاتە ئەو ئاستەی کە بتوانێت شێوازێکی بیرکاری دڵنیاکەر وەربگرێت و بەکاری بێنێت بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو قۆناغەدا کە پێویستە گوێزانەوەی تێدا بکرێت

لەبەلگەكاریەوە بۆ تاقیكردنەوە، ئەمەش لەكاتێكدایە كە یاسا سروشتیەكان هەموویان دەبنە هۆی بەدیهێنانی چەند ئەنجامێكی گریمانەیی و هەمووشیان كۆكن لە گەڵ سەروبەندی واقیعیەتە ڕاوەستاوەكاندا بەكردەیی. لەم قۆناغە دا ( سروشت ناس ) پەنا دەبات بۆ تاقیكردنەوەكان، بەلام هەر لەم قۆناغەدا سیفەتی خاوەن شكۆ و دەسەلاتدار هەلدەبژێریت بۆ خۆی، بەشێوەیەك خۆی وا دادەنێت كە لێكدانەوە و ڕاڤەكانی ناسە پێنێت بەلكو دەیسە پێنێت بەسەر سروشتدا بە سەپاندن.

ئەمەش بەو ئیعتیبارە دادەنێت كە دیاردە سروشتیەكان و شوێنەوارە بەرهەم هاتووەكانی لەئەنجامی كۆبوونەوەی بەشەكاندا پێك هاتووە بۆ كشان ( درێژبوونەوە ) و شێوەی ( ٦٧ ) ئەندازەیی دیاریكراو و جولەی دیاریكراویان هەیە لەسەر ئەو ئاڕاستەیەی كە بەشەكانی ( پارچەكانی ) ئامێرێكی پیشەسازی یان بەشەكانی تەنێكی دروستكراو لەسەری كۆ دەبنەوە. دیكارت تێبینی ئەوەی دەكرد ئەم هاوسەنگیە لەنێوان دیاردە سروشتیەكان و ئامێرە پیشەسازی و بەرهەمە دروستكراوەكانیدا بۆ ئەو گەورەترین سوود و كەلكی هەبووە لە هەموو تەفسیر و ڕاڤەكردنێكدا كە پێی هەستاوە بۆ دیاردە تاییەتیەكان. بەوەی كە جیاوازی نیە لەنێوان ئەو ئامێر و دروستكراوانەدا بەشێوەیەكی گشتی و لەنێوان دیاردە سروشتیەكاندا تەنها لەوە دا نەبێت كە بەشەكانی ئەو ئامێرانەی دەبنە هۆی بەدیهێنانی ئەنجامە داواكراوەكان گەورەن بەشێوەیەك ئەندامەكانی جەستەی مرۆڤ وا دەركیان پێدەكات، لەكاتێكدا بەشەكانی دیاردە سروشتیەكان زۆر بچوكن بەشێوەیەك تێی پەڕاندووە لەتوانای دەرك پێكردن و هەستەكانی ئێمە.

دەگونجێ بۆ ڕاڤەكردنی دیاردە سروشتیەكان پەنا بەرینە بەر بەشەكانی مادده لەسەر ئەو ئاڕاستەی كە بكرێت لەگەڵیدا بۆ داهێنان و تازەگەری دیاردە هاوشێوەكان بۆ ئەوەی كە دەمانەوێت ڕاڤەی بكەین بەمەبەستی سروشتی نەك تەنها وەك كارگەیەكی پێكهێنان و دروست كردن، ڕاڤەی سروشتی : پێكهێنانی دیاردەكانە سەر لەنوێ، یان هەوڵدانێكە لە لایەن مرۆڤەوە بەشێوەیەكی گشتی و لە لایەن سروشتەوە بەشێوەیەكی تایبەتی بۆ دروستكردنی دیاردەكان یان دروستكردنی ئەوەی كە هاوتای دیاردەكان بێت و لەوان بچێت یان هاوشێوەی ئەوان بێت. لەبەر ئەمەشە كە ( سروشت ناس ) دەكرێ زانا بێت یان ئەندازیار بێت یان پیشەگەر ( دروست كەر )ێك بێت لەهەمان كاتدا.

لە هەموو ئەم توێژینەوانەیدا دیكارت بیر و بۆچوونی خۆی كورت كردەوە بە پوختی ئەو ئیعتیبارەی بۆ خۆی دانا كە وەك هاندەرێك ( تەماشاچیەك ) لەسەر ئەم جیهانە نوێیەی كە لەتوانای خوا دایە دروستی بكات لە هەر چركەیەكدا، لەكشان و جوڵەی ئەندازەیی و یەكخستنیان.

پاشان سەرنج دەدەین دەبینین دیكارت لەخەیاڵ و ئەندێشەی خۆیدا خۆی بەدروستكەرێك دادەنێت نەك بۆ تەواوكردنی دروستكراوە خواییەكان چونكە ئەوان هەر لە سەرەتاوە كامڵ و بێكەم و كوڕین بەڵكو بۆ دروست كردنی ئەو دیاردانەی كە هاوشێوەی ئەو دیاردانە بن وا لەجیهاندا هەن. بەمەش دەبینە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوا لەسەر سروشت.( ٦٨ )

## مرۆڤ لای دیکارت:

ئەشێ مرۆڤ ئـالۆزترین دروسـتکراوەکانی ( هەبوونـەکانی ) سروشـت بێـت و پلـە و پایـەی چـاودێر وەرگرێـت بـەو ئیعتیبـارەی بەشـێکە لـە جیهـان و جەستەیەکە لە جەستە سروشـتیەکان. لـە بـەر ئـەوە دیکـارت ڕەچـاوی ئـەوەی دەکرد لێکۆڵینەوەکەی سەرچاوە دەگرێت لە لێکۆڵینەوەی جیهان، بەوەی ( من )، یـان دەروون، بنـەمای یەکـەمین فەلسـەفەیە، فەلسـەفە ئـەو درەختەیـە کـە ڕەگەکانی بریتیە لە میتافیزیکا و قەدەکەشی بریتیە لە فیزیکا و لق و پۆپـە سەرەکیەکانیشی بریتین لە میکانیك و پزیشکی و ئەخلاق ( ڕەوشتەکان ).( ٦٩ )

دیکارت جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە بینای فەلسەفەی گەورە و بەنرخ و لوتکە بڵند لەسەر سێ حەقیقەتی گەورە و جێگیر و سەلمێنراو ڕادەوەستێت کە ئەوانیش بریتین لە : دەروون و خودا و جیهان.

دیکارت ئەو سەرنجەشی لە بەرچاو دەگرت کە سێ زانستی چەسپاندن هەن بریتین لە میکانیك و پزیشکی و ئەخلاق ئـەم  سیانە  بەسـتراون بـەو زانسـتی سروشتەوە کە توێژینەوە دەکات لە ماهیـەتی هـەبووەکانی جیهـان، گـرنگترین جۆرەکـانی ئـەو هەبووانـەش لـە تایبە تمەندێتیـە سـەرەکیەکانی هـەر یەکێکاندایە. دەست پێدەکەین بەلێکۆڵینەوە سەبارەت بە ئەستێرەکان و خۆر و مـانگ، پاشـان لێکۆڵینـەوە لـە سـەر تیشـك ئـە نجام ئـەدەین، پـاش ئـەویش هەبووەکان ( دروستکراوەکانی ) جیهان و تایبە تمەندێتی ئـەو دروسـتکراوانە و پێکهاتە جوڵەییەکەیان و کردارەکانیـان و کاردانەوەکانیشیان. لێکۆڵینـەوەی سروشت لە بنەڕەت و پرۆگرامی خۆیدا لەسـەر ئـەو ئیعتیبـارە هەڵدەسـتێت بـە گەڕاندنەوەی هەبووەکان ( دروستکراوەکان ) بۆ کشان و جوڵە، ئەم ئیعتیبـارەش ڕابەرایەتیمان دەکـات بـۆ زانـین و زانیارییـەکی تێـر و تەسـەل و ڕێکخـراو بـۆ

دیاردە سروشتیەكان، هەر وەك چۆن بەهۆی بەدیهێنانی ئەو زانیاریەوە دیاردەكان بەكار دەهێنین لەوانەش (دیاردە مرۆییەكان) ئەمەش لە پێناوی گرتنە دەستی دەسەڵات و شكۆمەندی بەسەر جیهاندا و بەسەر مرۆڤدا لەهەمان كاتدا.

لەم دیدەوە پەیوەندیەكی بەتین هەیە لەنێوان زانست و سەركردایەتیدا، لەنێوان زانستی سروشت (سروشت ناسی) لە لایەك و لەنێوان میكانیك و پزیشكی و ئەخلاق دا لە لایەكیترەوە. دەگونجێ لێكۆڵینەوەی جەستەی مرۆڤ لە رێگای پزیشكیەوە ئەنجام بدرێت لەسەر ئەو ئیعتیبارەی كە بریتیە لە كۆمەڵێك پێكەوە بەستراو لە ئاوێتە (پێكهاتە)ی میكانیكی، جیاوازی نیە لەگەڵ ئەو پێكهاتە ئاوەكیانەی لەجەستە بەستووەكاندان لە ڕووی وردی بەشەكانی و شارەزایی پێكهاتنەكەیدا. پزیشكیی رێگاخۆش كەرە بۆ زانین و زانیاری جەستەی مرۆیی لەبارەی بەشەكانی و پێكهاتە جیاوازەكانی، هەروەها لە پەیوەندیەكانی نێوان ئەو بەشانە و ئەو پێكهاتنانەی كە لەنێوانیاندایە، بۆیە پێی هەڵدەستێت لەسەر زانستی توێكاری تەنها بە پێی ئەو ڕەچاوكردنەی دیكارت.

توێكاری بنچینەیەكی بەرتەسك و تەنگەبەرە بەهەموو مانایەكی تەنگەبەری بۆ چارەسەركردنی جەستەی مرۆیی، ئەمە ڕوون بوویەوە بۆ دیكارت لە كۆتایی تاقیكردنەوەكان و توێژینەوەكانیدا، تێبینی دەكرێت دیكارت لەسالانی كۆتایی ژیانیدا بڕوای بە پزیشكیی كەمتر و لاوازتر بووە لەچاو سالانی پێشوویدا وەك دەردەكەوێت لە هەر دوو كتێبی "*ڕامانەكان*" و "*بنەماكانی فەلسەفە*"دا، ئەڵتەرناتیڤی گەڕانەوەی لەچارەسەركردنی نەخۆشیەكاندا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیعتیباری سروشت و بەرگریی سروشتی بۆ

جەستە، وە قایل نەبوونی بەگۆشەنیگای میکانیکی بۆ جەستە و زانستی تویکاری.

بەڵام زانستی ئەخلاق لە دوای پزیشکیی دێت لە ڕیکخستنی ڕیز بەندی ئەو هونەرانەی کە لەسەر "فیزیکا" وەستاوون، ئەمەش بریتیە لەو زانستەی مرۆڤ لە ئاراستەی خۆیەوە لێکۆڵینەوەی لەسەردەکات بەرەو بەختەوەری و بەخشندەیی، ئەو زانستەیە کە شارەزایی تەواو دەسە پێنێت بەسەر هەموو زانین و زانیارییەکاندا( ٧٠ ) بەوەی کە میتافیزیکا دەیسە پێنێت و مرۆڤ دادەنێت بە ( نەفس ـ دەروون )، هەروەها هەموو دڵنیاییەکان ڕاوەستاون لەسەر دەروون، پاشان ئەو فیزیکا و هونەرەکانی میکانیك و پزیشکیەی کە وەستاوون لەسەری دەیانسە پێنێت. بەمەش مرۆڤ دەبێتە دەروونێکی یەکگرتوو بە جەستەوە، بەختەوەری مرۆڤ لەسەر چەند شتێك ڕادەوەستێت لە پێشەوەی هەموویاندا تەندروستی جەستەیە و هەروەها زامن کردنی ئەمەش نایەتە دی تەنها بەهۆی بەخششی زانیاری تەواوەوە نەبێت بۆ پێکهاتنی جەستە و بەدەنگەوە هاتنە جۆربەجۆرەکانیەوە.

زانستی ئەخلاق هەروەك دیکارت ڕەچاوی دەکرد زانیاری تەواو دەسە پێنێت بەسەر هەموو زانین و زانیاری و زانستەکاندا، پێویستە فەیلەسوف بگاتە ئاستی تەواوکردنی ئەم زانستە لەکاتێکدا بەرەو پێش دەچێت و هەنگاو هەڵدەگرێت لە لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە جۆربەجۆرەکانیدا، پێویستە دڵنیایی میتافیزیکی خۆی جێگیر و پتەو بکات بە جێگیرکردنێکی یەکجارەکی و کۆتایی. لەبەر ئەوە هەوڵدانەکانی دیکارت لەمەیدانی ئەخلاقدا دوا هەوڵدانە فەلسەفیەکانی بووە.

ئەوە بەدی دەکرێت لەدیکارتدا لەکاتی هەستانی بە پرۆژە زانستی و فەلسەفیەکانی چەند بنەمایەکی ئەخلاقی کاتیی دۆزییێتەوە بۆ ئەوەی بەدوودڵی و سەرسامی نەمێنێتەوە لە ئیش و کار و ژیانی کردەیی رۆژانەیدا، لەکاتێکدا توێژینەوەی دەکرد لەبارەی زانستێکی کامڵ و پەیوەندیدار بە حەقیقەتە جیاوازەکان،(٧١) خودی ئەم زانستەش دادەمەزرێت لەسەر دڵنیاییەکی فەلسەفی ڕەها. دیکارت لە کتێبەکەیدا بەناوی *"وتارێك دەربارەی میتۆد"* لەبارەی ئەم بنەمایانەوە تەعبیر و دەربڕینەکانی خۆی بەڕوونی پیشانداوە. بەڵام ئامانجی لەوەرگرتنی ئەو بنەمایانە دۆزینەوەی زانستێکی ئەخلاقی یان بیر و باوەڕێکی ئەخلاقی نەبووە، بەڵکو ڕوویەڕووی ئیش و کار و ژیانی بووەتەوە لەکاتی توێژینەوەدا. ئامانجی بنەمای ئەخلاقیەتی کردەیی جگە لەئامانجی تاکەکەسی هیچیتر نیە. لەبەر ئەوە دیکارت ئیشی لەسەر ناردنە دەرەوە و زاخاودانەوەی نەکردووە پاش توێژینەوە دوور و درێژەکەی لەسروشتی مرۆڤایەتی یان لەکۆمەڵگادا، بەڵکو لەمەدا کەوتۆتە شوێن نزیکترین سەرچاوە لەخۆیەوە کە ئەویش عەقڵی ساغ و دروستی خۆی و ئەو رۆشنبیریەیەتی وەریگرتووە لە مامۆستا یەسوعیەکانەوە، ئەو بنەمایانەی هەڵگرتبوو لەگەڵ هێمنی و لەسەرخۆیی ئەو عەقڵەیدا کە هەر عەقڵی دیکارت پێیان ئاشنا بوو لەگەڵ شتێك لە رۆحی ئەو زانیاریانەی لەو بارەیەوە خۆی وەریگرتبوو، هەروەها شتێکیش فێر بووبوو لەو کتێبانەی وا لەسەردەمی خۆیدا باو بوون لەکتێبە ئەخلاقیەکان و لەهەندێ لەو کتێبانەش کە لەگەڵ مامۆستاکانی خۆیدا دەیا نخوێندەوە مەبەستیشمان لەو کتێبانە ئەوانەی ڕەواقیەکانە لەبارەی ئەخلاقەوە بەتایبەتی نووسراوەکانی (ئەبیکتاتۆس) و (سنیکا).

هەروەك چۆن دیکارت پرۆگرامی زانستیی لە کتێبەکەیدا "*وتارێك دەربارەی میتۆد*" دەگەڕاندەوە بۆ چەند بنەمایەکی کورتکراوە، بەهەمان شێوە و لەهەمان کتێبدا ئەخلاق دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بنەمایانەی کە لەسێ و چوار بنەما زیاتر تێنا پەڕن.

لە بنەمای یەکەمدا ئەو مەبەستەی کە هەیەتی و دەیەوێ بەکورتی دەریبڕێت بریتیە لەوەی کە فەیلەسوف دەبێ بگەڕێتەوە بۆ یاسا و داب و نەریتی وڵاتەکەی خۆی و پارێزگاری لەو دینەش بکات کە خوا پێی بەخشیوە هەر لەکاتی لەدایك بوونیەوە و لەکارەکانیدا شوێنکەوتووی زۆرینەی ڕاوبۆچوونە باوەکان بێت و یەکسانی و داد پەروەریان تیا بەدی بکرێت و دووریان خاتەوە لەتوند و تیژی.

بنەمای دووەمیش مەبەستی لەنەبوونی مەرجەکانی دڵنیایی کاملە لەو بیر و بۆچوونانەی وەریگرتوون لە مەیدانی زانستیدا لەسەر ئەوەی کە پابەندیان بێت لە وەختی جێبەجێکردنی دا بە پێی ئەو ڕایەی کە دەستنیشانی کردوە بەبێ دوودڵی.

بەڵام بنەمای سێیەم لەو شوێنکەوتنەی فەیلەسووفەوە دەردەچێت کە لەئەنجامی شوێنکەوتنی ئەو حیکمەتە گەورانەی ڕەواقیەکانەوە بەدەستی هێناوە، مەبەست لەو حیکمەتانەش چاودێری کردنی مرۆڤە جا ئەو چاودێریە لە دەروونی مرۆڤ خۆیەوە بێت یان لەئەنجامی مەترسیەکانی دەروون و فەرمانەکانیەوە بێت، وە گرنگی نەدان بەو ڕووداوە دەرەکیانەی لە پڕ دا دێن و دەگونجێت ئاکامە ڕاستەوخۆکانیشیان چاك یان خراپ بێت. لە حاڵەتی شوێن کەوتنمان بەم حیکمەتە (ژیری و دانایيە) دەگەینە پلەی سەرکردایەتی کردن

و زاڵبوونی تەواو بەسەر حەز و ئارەزووەکا نماندا ئەو کاتەش سەرکەوتوو دەبین لەنێوان ویست و ئیرادەی خۆمان و چاودێری یەزدانیدا.

پێویستە لەسەر فەیلەسوف بەردەوام بێت لەسەر شوێنکەوتنی ئەو بەرنامەی ژیانەی وا خۆی دەستنیشانی کردووە بۆ خۆی لەڕێگای توێژینەوە لە هەموو مەیدانە جیاوازەکاندا بە بێخۆبەستنەوە بەهیچ کۆت و بەندێکەوە جگە لەفەرمان و بڕیارەکانی عەقڵ نەبێت. لەم بنەمایەی کۆتاییەوە دیکارت فەلسەفەی ئەخلاقیی کاملی دۆزیەوە بە مانایەکی ڕاست و دروست.

دیکارت ڕەچاوی ئەوەشی کرد کە بێگومان هەر دەبێ بگاتە پلەی سەرکردایەتیکردن بەسەر جەستە و بەدەنەکاندا، سەرکردایەتیەکی وا کە بەرنامە و زانستی سروشتی ڕێگەی پێ بدەن، بەجۆرێك دەروون بتوانێت زاڵ بێت بەسەر هەڵچوون و کاردانەوەکاندا لەسەر گۆڕەپانی یەکگرتنی دەروون و بەدەن یان لەسەر گۆڕەپانی مرۆیی بەهەموو تەواوکاریەکیەوە بەمەش دەکرێ ڕوو بکەینە بەختەوەری. بە پێوانەکاری ئێمە تێگەیشتین لە هەڵچوون و کاردانەوەکان لەکاتێکدا دەبێت کە حاڵەتەکانی دەروون بزانین ئایا باشە یان خراپە، ئایا (ویست و ئیرادەیە) یان (دەرك پێکردنە).

دەروون چالاك و کارایە لە ویست و ئیرادەدا، جا ئیتر ئەم کارەی قبوڵ بکرێت یان ڕەتکرێتەوە، هەروەها دەروون سلبیە (خراپە) لە دەرك پێکردندا بەرامبەر بەو دەرك کردنانەی کە هەیەتی بۆ جەستە دەرەکیەکان یان لە ناو ئەو جەستەیەشدا کە یەکیگرتوە لەگەڵیدا، جیاکردنەوی کاردانەوەکان لە دەرك پێکردنەکان بەوە دەبێت کە کاردانەوەکان لەگەڵ دەرچوونیدا لە دەروون لەبارەی بابەتە دەرەکیەکان و لە بەدەنەوەیە کە بەستراوە بە ژیانی دەروونەوە

بە بەستنەوەیەکی زۆر بەتین. بەیەك گەیشتنی دەروون و بەدەنیش لە ڕێگای سوڕی خوێنەوە ئەنجام دەدرێت و تەواو دەبێت.

کاردانەوە بە پێی بۆچوونی دیکارت نیشانەیەکە لەگرنگترین نیشانەکانی دڵنیابوون لە یەکگرتنی دەروون و جەستە و دەرکەوتەیەکە لە گرنگترین دەرکەوتەکان لەسەر گرنگی دا نمان بە بابەتە دەرەکیەکان ئەوانەی وا پەیوەندیان هەیە بە دەروونەوە. لە بەر ئەوە کاردانەوە هاوشێوەی ئەرکی چێژ و ئازارە ( خۆشی و ناخۆشی )یە. کاردانەوە چارەسەر دەکرێت لەسەر بناغەی کاردانەوە خۆی و لەسەر زانینی چۆنێتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی لە ژیا نماندا. چونکە ئەو لە لایەکەوە لە سەر زانینی ئەو یاسایانە هەڵدەستێت کە جەستەمان ملکەچیەتی وەك هەر جەستەیەك لە جەستەکانی جیهان، لە لایەکیترەوە هەڵدەستێت لەسەر زانینی پەیوەندیە بەردەوامەکان لە واقیع و تاقیکردنەوە دا لەنێوان حاڵەتەکانی دەروون و حاڵەتەکانی بەدەن دا.

## بیر و ڕا کۆمەڵایەتیەکانی دیکارت:

بەدڵنیاییەوە مرۆڤ کائینێکی کۆمەڵایەتیە و سروشتی کۆمەڵایەتی وای لێدەکات ژیانی داباڕان و دوورە پەرێزی وەلاوە بنێت بەو ئیعتیبارەی بەشێکە لە هەموو، بێگومان هەر دەبێ لەگەڵ کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکاندا بژی. دیکارت دەڵێت: پێویستە هەر یەکێك لە ئێمە ئەوە بزانێت ئەگەر بێتوو کەسێکی دابڕاو بێت لەخەڵکانیتر ئەوا ناتوانێت بەتەنها بژی چونکە لە واقیعدا بەشێکە ( پارچە )یەکە لە بەشەکانی بوونەوەر (کەون)، لەسەر ئەو تاییە تمەندێتیەی کە هەر شتێك بەشێکە لەو شتەی خۆی بۆ نموونە تاکەکەسێك بەشێکە لەو زەویەی کە لەسەری دەژی هەروەها بەشێکە لەو دەوڵەتەی کە تیایدایە و

دیسان بەشێكە لەو كۆمەڵەی كە لەگەڵیاندایە و بەشێكیشە لەو خێزانەی كە تێیدا دەژی و بەستراوە بە شوێنی نیشتەجێ بوون و لەدایكبوونیەوە.( ٧٢ )

دیكارت ئەوەشی بەدی دەكرد كە ژیانی خەڵك لەكۆمەڵگا دا تەنها حاڵەتێكی سروشتی نیە بەڵكو وەستاوە لەسەر كرداره ئاڵوگۆڕكراوەكان و پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكان كە تایبەت و وابەستەن بەمرۆڤەوە لەو ڕووەوە كە بزانێت ئەو مرۆڤە. لەبەر ئەوە مرۆڤەكان هەندێكیان پەیوەستن بەهەندێكیتریانەوە نەك تەنها بەهۆی سوێندخواردنەوە بەڵكو دیسان بەهۆی هاوڕێیەتی و برایەتیەوە. بە پێی چەمكی دیكارت كۆمەڵێك لە خەڵك هەست بەهاوڕێیەتی هەست بزوێنی زیاتر و كاملتر دەكەن وەك لەوەی كە دەیبینین لە ئەخلاقیاتی ئەرستۆ دا. دیكارت لەنامەیەكدا بۆ "فۆشیوس" دەڵێت: لەژیانی كۆمەڵایەتیدا هیچ شتێك نیە وەك هاوڕێیەتی خێر و چاكەی گەورەی تێدا بێت.

جگە لەوەی كە هاوڕێیەتی دادەنرێت بەهەستكردنێكی كۆمەڵایەتی قوڵ و پەیوەندیەكی مرۆڤایەتی پیرۆز لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە تاكە دەركەوتەیەك نیە كە ژیانی كۆمەڵایەتی پێ جیا بكەینەوە و بیچەسپێنین بەئاكاری ئینسانیەوە. بەڵكو دووبارە دەروونی لێبوردە و بەخشندە هەیە كە لەبارەیەوە دیكارت دەڵێت: بەڕاستی دەروونە بەخشندە و لێبوردەكان نەتەوەیەكی ئازاد و سەرفرازن و بەخشندە وتە باو بران و ڕێز لە خۆیان دەرگرن تا بەرزترین ئاست و پلەی گونجاو تێی دەپەڕێنن لە ڕێزگرتندا. هەروەك چۆن ڕێز گرتنی خۆیان دەزانن هەروەها بەوجۆرەش ڕێز گرتن لە خەڵكانیتری دەرەوەی خۆیان دەزانن. ئەمانە خۆیان لەو ئاستە دانانێن كە ئیتر كەس نیە لەسەروویانەوە و پلە و پایە و شكۆمەندی و زانیاریان بە جۆرێكە كەس ناتوانێت شان بدات لە شانیان، هەروەها خۆشیان ئەوەندە بەرز و بلند ڕاناگرن بەسەر ئەوانەی خوار

خۆیاندا، چونکە ئەوە ڕەچاو دەکەن کە هەموو ئەم شتانە بێنرخ و لاوازە لەچاو ئەو پێوانەیەی ئەوان دەیکەن بۆ ئەو ئیرادە چاکەیەی کە تەنها هەر خۆی تەرازووی ڕێزگرتنەکانی خۆیانە، هەروەها هەوڵ دەدەین بوونی ئەم دیاردەیە بسەلمێنین یان هیچ نەبێت بتوانین بوونی بچەسپێنین لە خەڵکانیتر دا جگە لەخۆیان، هەر لەبەر ئەمەشە دەیانبینیت کە ڕقیان لە کەس نیە و بەسووك سەیری کەس ناکەن، هەروەها حەزیان لە لێبووردەیی و بەخشندەییە لەکاتی تاوان و خراپەکاریدا بەرامبەریان و چاو دەپۆشن لەو هەڵپە و پەلامارە هەڵەشەییانەی کە دەکرێتە سەریان.(٧٣)

دەروونە بەخشندە و لێبووردەکان ڕاهاتوون لەسەر هەستانیان بە ڕازاندنەوە و بێخەوشی لە کارەکانیاندا و بەرەو پیری هیچ شتێك ناچن ئەگەر هەست بەوە نەکەن توانایان بەسەر ئەو شتەدا دەشکێت و دەرەقەتی دێن. بەکەمی گرنگی دەدەن بە بەرژەوەندیە تایبەتیەکانیان و چاویان لەوە نیە بزانن کام شت زۆرترین قازانج و سوودی هەیە بۆ خۆیان و ببنە بەربەستی چاکەخوازی لەبەردەم خەڵکیدا. لەبەر ئەوە هەمیشە دەیانبینین ڕێز و ئەدەبێکی کاملیان هەیە و دڵخۆشی و نەرم و نیان و بەڕەوشتن، هەروەها دەستەونەزەر (دەست لەسەر سنگ) ئامادەن بەهەموو شێوەیەك خزمەتی هەر یەکێك لە کۆمەڵانی خەڵك بکەن. لەگەڵ ئەمانەشدا دەیانبینیت بەسەر سۆزداریی و ئارەزووەکانی خۆیاندا و پاك و بێگەردن لە کینە و ناکۆکیەکانی نێوان خۆیان و خەڵکیدا، ڕق و ترس و تووڕە بوون و هەڵچوون نیە لە ناو کردار و هەڵس و کەوت و ڕەفتاریاندا بەرامبەر خەڵکانیتر.

ژیانی کۆمەڵایەتی بەگوێرەی بیروڕای دیکارت بەوە پێناسە دەکرێت کە دووبارە بریتیش بێت لە پێچەوانەی هاوڕێیەتی و خۆشەویستی، خەفەکردنی

ئارەزووەكان و ناكۆكی نێوان خولیا و حەزەكانی خەڵكە. بەڵام لێرەدا ڕێگا چارەیەك هەیە بۆ هێوركردنەوە و دانانی سنوورێك بۆ جیاوازیەكان لەژیانی نێو كۆمەڵگاكاندا و دەستەبەركردنی خۆگونجاندن و ڕێكەوتن لەنێوان خەڵكیدا، ئەوەش بەوە دەبێت كە عەقڵ بكەین بە ناوبژیوان و داوەر بێت لە هەموو دوژمنایەتی و ناكۆكیەكاندا و ژمارەی حەقیقەتە زانستیە بەڵگە نەویستەكان زیاد بكەین و پەرەیان پێبدەین، هەروەها ئیش بكەین لەسەر بڵاوكردنەوەیان بە جیهاندا لەسەر فراوانترین پانتایی و شێواز. بە دڵنیاییەوە گەڕانەوە بۆ عەقڵ و بڕیاردان پێی، ژیانی كۆمەڵایەتی بالاترین و ناودارترین شوێن و جێگای دەبێت و بەرزترین ڕێزی لێدەگیرێت.

لای دیكارت عەقڵ فەرمانێكی تریشی هەیە، بریتیە لەوەی كە ئەو بڕیار دەدات لە حاڵەتی بەركەوتن ( شۆك )ی نێوان تاك و كۆمەڵ، كامیان لەسەر حەقە و كامیشیان پێویستە قوربانی بەخودی خۆی بدات لە پێناوی ئەویتردا.

بیرمەند دەتوانێت گەر بڕوانێتە دەروونی خۆی و عەقڵی بخاتە كار بۆ ڕێنماییكردن و یارمەتیدانی بۆ ئەو ڕێگایەی كە پێویستە بیگرێتە بەر، چونكە ئەمە چاكترە لەوەی وا دەستگیری دەبێت لە ئەنجامی سەرنج دان و وردبونەوەی لە هەڵس و كەوت و خوو ڕەوشتی خەڵك لە كۆمەڵگا دا، دیكارت بیری بۆ ئەوە دەڕوات دەڵێ: هەڵەیە خۆمان بخەینە گێژاوێكی نالەبار و گەورەوە لە بەر هیچیش نا تەنها بۆ ئەوەی سوود و قازانجێكی كەم بگەیەنین بە دایك و باوكمان یان وڵاتەكەمان. هەر چەندە تەنها كەسێك ئەگەر نرخ و بەهای خۆی زیاتر كرد لەسەر هەموو خەڵكی شارەكەی، ئەوا ئەو كەسە لە

هەڵـە دایـە گـەر هـات و خـۆی کـردە سەرچـاوەی تیاچـوون بـۆ ڕزگـارکردنی ئەوان.( ٧٤ )

هەروەك دیکارت ڕەچاوی دەکات پێویست نیە لە سەر مرۆڤ خـۆی بهاوێتـە نێو حەقیقەتێکەوە تەنها بۆ ئەوەی ڕێزی خۆی زیاد کات لەسەر هەموو خـەڵکی شارەکەی و جگە لەوەی ئەو حاڵەتەش پێچەوانەی ئەوە بێت کە ئەو کەسە خۆی دەداتە پاڵ ئەو کۆمەڵە و بەلام ئەو کۆمەڵەش خۆیان وابەستەی ژیری و دانایی بن و گەورەترین چاودێرییکەر بن بەو ژیر و داناییە.

ڕۆشـنبیری و شارسـتانێتی هـەر نەتەوەیـەك پێوانـە دەکرێـت بـە ئاسـتی بلاوبوونەوەی فەلسەفە یان فەلسەفاندنی ڕاست و دروست تێیدا( ٧٥ )، لـە بـەر ئـەوە باشـترین خێـر و چـاکەیەك کـە خـوا بیرژێنێـت بەسـەر هـەر شـارێك لـە شارەکانی ولاتدا بریتیە لە بەخشینی فەیلەسووفە حەقیقیەکان و ڕاسـتگۆکان بە ئەو شوێن و ولاتە.

تـاك پێویستی بە هیچ شتێکیتر نیە جگە لە تێڕامان نەبێت بۆ ئەوەی لـە دەروونی خۆیدا ئەو پێوانەیە بدۆزێتەوە تا پێوانەی خزمەتی خـۆی پـێ بکـات بـۆ کۆمەڵگاکـەی. دیکـارت دەڵێـت: دان بـەوە دادەنـێم کـە زەحمەتـە لەسـەر شێوەیەکی وردەکار بتوانین پێوانە و ئاستەکان دیاری بکـەین بـۆ هـەر مـاوە و درێژبوونەوەیـەك وا عـەقڵ فـەرما نمان بەسـەردا دەدات بـۆ ئـەوەی چـاودێری بەرژەوەندیەکانی جەماوەری پێ بکەین، بەلام ئەمـە لـەو ئـیش و کـار و جـۆرە حاڵەتـانـە نیـە کـە بتوانرێـت زۆر بـە وردی پشـکنینی تێـدا بکرێـت، بـەڵکو بـەگوێرەی ئـەو کەسـەیە کـە ویـژدانی خـۆی پـێی ڕازیـە و ئـارەزووی بـۆی دەچێت.( ٧٦ )

تێبینی دەکرێت لە ڕوانگەی بیر و ڕاو گۆشەنیگاکانی دیکارتەوە ئەو کۆمەڵگا بەخشندە و سەرکەوتووەی کە ئەو دەیەوێت بریتییە لەو کۆمەڵگایەی کە لە لایەن ئەرستۆکراتیەتی فیکریەوە بەڕێوە بچێت و سەرپەرشتی بکرێت، وە جڵەوی سەرکردایەتی کردنەکەی بدرێتە دەست فەیلەسووفێکی دادوەر کە لەهەمان کاتدا ئەو فەیلەسوفە تاکە فەرمانڕەوا و کاربەدەستی ژێر و کارامە بێت.

ڕوون و ئاشکرایە دیکارت ئەم قسەیە دەکات لە ڕوانگەی هەبوونی پرۆژەیەکی نموونەیی کامڵەوە، چونکە ئەو باوەڕی بە هەندێ لە یاسا بنەڕەتیەکان زیاترە وەك لەوەی باوەڕ بکات بە خەڵك و تاقیکردنەوە کۆمەڵایەتیەکان. بەمەش مانایەك بۆ سیاسەت نامێنێتەوە جگە ڕێزگرتن لە هەندێ لەو بنەمایانە نەبێت کە ئەو فەرمانڕەوا بڕیار بە دەستە تاك و تەنها و بینەرە نەبێت وا سەرپشك کراوە لە مافی بڕیاردان و هەڵس و کەوت لە ئیش و کارە مرۆڤایەتیەکاندا.

## نەزۆکی مشتومڕی قوتابخانەیی:

دیکارت لە بنەمای دەیەمی کتێبی *"وتارێك دەربارەی میتۆد"*دا دەڵێت: دان بەوەدا دەنێم کە من لە دایك بووم و هاتوومە دنیاوە لە دەروونمدا ئارەزوویەکی عەقڵی هەیە وای لێکردووم کە تام و چێژێکی زۆر بەدی بکەم لە دۆزینەوەی بەڵگەکان بە دەروونی خۆم و بۆ خۆمیان فەراهەم بێنم، بە بێگوێگرتن لە بەڵگە بچوکەکان. بە ڕاستی ئەمە بوو بە یەکەمین هاندەرم بۆ لێکۆڵینەوە زانستەکان هەر لەتەمەنی منداڵیمەوە. وام لێهاتبوو هەر کاتێك ڕێکەوتی کتێبێکی وام بکردایە کە خوێنەری بۆ لای خۆی کێش کردایە بۆ

دۆزینـەوە نوێیـەكان، ئـەوا مـن خێـرا هـەوڵم دەدا و چـاوم دەگێـڕا بـۆ ئـەوەی بەشكوم بتوانـم بگەمە ئە نجامێكی وا كـە هاوشێوەی ئیعتیمـادكردنم بێـت لـە سـەر تێگەیشـتنی سروشـتیم، نـاهێڵم ئـەو چـێژە پـاك و بێگـەردە بەسـەرما تێپـەڕێت بـە پەلـەكردن لـە خوێندنـەوەی كتێبـەكان. بـەزۆری سـەركەوتنم بەدەست هێناوە لەم هەوڵدانەمدا، تەنانەت هەست بەوە دەكەم گەیشـتووم بـە حەقیقـەت، نـەك وەك ئـەو حاڵەتـەی كـە هەیـە لای هـەموو خـەڵك بـە هـۆی توێژینەوە ناتەواو و ناچاریەكانەوە كە دروون لـە ڕاسـتیەوە، پشـت دەبەسـتن بەڕێكەوت زیـاتر وەك ئـەوە پشـت ئەسـتوور بـن لەسـەر بەرنامـە و پرۆگـرام، بـەڵكو لەسـایەی دۆزینـەوەم دابـوو پـاش تـاقیكردنـەوەی دوور و درێـژ لەسـەر بنەماكانی ( بنچینەكانی ) دڵنیایی كە زۆر سوودمەند بوون بـۆم لـە ڕادەبـەر بـۆ لێكۆڵینەوە زانستیەكانم ئەوەش ئەو بنەما و ڕێسایانە بوون كە لە پاشاندا بە كارم دەهێنـان لە زۆربەی دۆزینەوەكانمدا.

بـەم جـۆرە خـووم پێـوە گـرت و ڕاهـاتم لەسـەر ئـەوەی كـار لەسـەر ئـەم بەرنامەیە بكەم بە كاركردنێكی ورد بینی و دڵنیاكەر بەوەی كە بەكاری دێنم و پێڕەوی دەكەم وەك سەركەوتووترین هۆكارەكان بۆ لێكۆڵینەوە.

بەڵام، لەبەر ئەوەی عەقڵەكان هەموویان یەكسان نین لە ئامادەباشیدا بۆ دۆزینەوەی شتەكان لە خودی خۆیان و هاندانی هێز و تواناكانیان، ئەو بنـەما ( ڕێسا ) ئامادەیەی فێری بووین پێمان دەڵێ پێویست ناكات پێشوازی بكرێت لە نارەحەتترین شتەكان و ئەوانەیان كە بەتین و هێزن، بەڵكو یەكە مجار گرنگـی دەدرێت بە قوڵبوونەوە لە سادەترین هونەرەكان و كـەمترین هیلاكـی پێویسـت، بەتـایبەتی ئەوانـەیان كـە بـەزۆری سـوود لـە یاسـا وەردەگیرێـت تێیانـدا وەك لـەوانی‌تر، وەك پیشەسـازی ( تـەون و جۆلاگـەری ) قـاڵی و ڕاخـەرەكان یـان

هونەرەکانی چنین یان نەخشاندن، هەروەك چۆن پێویستیشە بە هەمان شێوە گرنگی بدەین بەهەموو نووسین و دانراوە ژمارەییەکان، لەگەڵ کردارە ژمێرەییەکان و ئەوانەشی کە لەم بابەتانە دەچن.

لەکۆی هەموو ئەم هونەرانەدا ڕاهێنان و قایل بوون بۆ عەقڵ سەیرە، بە مەرجێك لە کەسانیترەوە فێر نەبوو بین بەڵکو خۆمان دۆزیبێتمانەوە و پەیمان پێ بردبێت. چونکە لەوانەیە هیچ شتێکی شاراوەیان تێدا نەبێت و هەر هەموویان بە تەواوی لە ئاڵوگۆڕ و هاتووچۆی عەقڵی مرۆییدان، دەیانبینین لە سەر جۆرەکان هیچ گەمارۆ و دەورەدانێك نیە لە دانراوەکاندا و جیاکردنەوەیان لە نێوانیدایە بە هەموو مانایەکی جیاکاری و ڕوون و ئاشکراییان تیا دەردەکەوێت بەهەموو شێوازێکی ڕوون و ئاشکرایی، ڕێکخستنی هەموو ئەمانەش بنەما و ڕێسایەکی دیاریکراو و سنورداره و چاکە و بەخشندەییەکەی لە گوێ ڕایەڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتن و زیرەکی مرۆڤایەتی.

لەبەر ئەوە بە ئاگا دێین بۆ پێویست بوونی توێژینەوە لەم شتانە بە پێی بەرنامە ( پرۆگرام ). پرۆگرامیش هیچی تێدا نیە جگە لە گوێڕایەڵی بەردەوام نەبێت بۆ ئەو یاسا نەگۆڕەی لە خودی شتەکە خۆیدایە یان ئەوەیە کە دۆزیومانەتەوە بە سەلیقە و شارەزایی خۆمان. بۆ نمونە، ئەگەر دێڕێك یان دەربڕینێکمان خوێندەوە نووسرابوو بە چەند ڕەمزێکی شاراوە و نادیار، بێگومان ئێمە لێرەدا هیچ یاسا و ڕێسایەکی تێدا شك نابەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ وا بێت بە خەیاڵ و ئەندێشەماندا کە یاسایەکی تێدایە، نەك بۆ لێکۆڵینەوە تەنها لە هەموو سەپاندنێك ( گریمانەیەك ) کە دەشێ دایینێین بەگوێرەی هەر ڕەمزێك تێیدا یان هەر وشەیەك یان هەر مانایەك، بەڵکو

دووبارە لە پێناوی ڕێکخستنی ئەو ڕەمزانەیان ئەو وشانە و ئەو مانایانەش. لە سەر شێوازێك كە بتوانین و بزانین بەهۆی خوێندنەوەوە ئەوەی پێویستە لێوەی دەستمان كەوێت. پێویستە كات بەفیڕۆ نەدەین لە خەملاندنی ئەم جۆرە شتانە دا بەڕێكەوت و بەبێ بوونی بەرنامە ( پرۆگرام ). لەوانەیە بتوانین ڕێمان لێ بكەوێت و بیدۆزینەوە بەم چۆنێتیەش و خێراتریش وەك لەوەی بەهۆی بەرنامەوە بیدۆزینەوە. بەلام تەنها بەم كارەمان لە ڕووناكی عەقڵ كەم دەكەینەوە و لاوازی دەكەین و دەیگەڕێنینەوە بۆ ئاستێك كە تەنها پەیوەست بێت بە ڕواڵەتی شتەكانەوە و دابڕا بێت لە چوونە ناوەوەی بۆ ناخی شتەكان.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا نابێت بكەوینە ناو هەڵەی ئەوانەوە كە فیكر و بیر و بۆچوونی خۆیان ناخەنە كار تەنها بۆ حاڵەتە ناوازەكان و شتە بالاكان نەبێت كە لەمەشدا پاش هەوڵ و كۆششێكی دوور و درێژ هیچ بەدەست ناهێنن تەنها زانستێكی تێكەڵ و پێكەڵ نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان وا دادەنێن یان ئارەزوویان لێیە بگەنە دەرەنجامێكی وا تا زانیاری و زانینێكی قووڵ لەو شتانە دا بەدەست بێنن، كە واتە پێویستە لەسەرمان مەشق و ڕاهێنان بكەین لەسەر شتە سادەكان وەك ئەوەی ئاماژەمان پێدا بەمەرجێك لە ژێر چاودێری و گوێڕایەڵی بەرنامە دابێت، هەروەها بۆ ئەوەی ڕابێین لەسەری و خوی پێوە بگرین بەگەیشتن بۆ حەقیقەتە شاراوەكانی ( ناوەكیەكانی ) شتەكان بە ڕێگا ئاسانەكان ئەو ڕێگایانەی كە پێمان نامۆ نین و دەیانناسین، ئەمە نزیكترە لەوەی تا بە شتێكیترەوە خەریك بین و سەرمان لە شتێكیترەوە دەرچێت. ئەو خێرایی و كەمترین كاتەش كە لەبەكارهێنانی بەرنامە دا دەستی پێدەكەین زیاترە وەك لەوەی بیرمان بۆی دەچێت لە بەكارهێنانی هێز و توانامان لەسەر

هێنانەوەی بەڵگەکاری بە بنەما بەدیهی و سەلمێنراوەکان لەسەر زۆر لەو بابەت و مەسەلانەی کە زیاد لە پێویست ئاڵۆزی و نارەحەتیان تێدایە.

بەلام هەندێ کەس سەریان لەوە سوور دەمێنێت کە ئێمە لە توێژینەوەکانماندا لەو هۆکارانەی زامن کەری بەرهەم هێنانی حەقیقەتەکانن هەندێکیان لە هەندێکی تریانە، بەمەش هەموو ئەو یاسا و رێسا و (بنەما)یانەمان پشت گوێ خستووە کە "جەدەلییەکان" رەچاویان کردووە تا بەهۆیانەوە بریار بدەن بەسەر عەقلی مرۆڤایەتیدا و سنوورداری کەن، ئەمەش لەو کاتانە دا روو دەدات کە شێوەیەکی دیاریکراو لە بیرکردنەوە دەسەپێنن بەسەر عەقلدا و دەبێتە هۆی بەدیهێنانی ئەنجامێك کە گوایە ئەوە پێویستە بە جۆرێك کە عەقڵ لە توانایدایە پەی پێ بەرێت بە مەرجێك تەنها پشت بەو شێوەیە ببەستێت، لەگەڵ ئەوەشدا روانینیان بە روونی و وریاییەوە لە خودی ئەو بەلگاندنە خۆی پشت گوێ خستووە. بەوەی کە دەبینین حەقیقەت بە زۆری دەرپەرپیوە و بەدی ناکرێت لەناو ئەو زنجیرانەدا، لەکاتێکدا هەر ماوەتەوە لە کۆت و بەندی ئەوانەی وا بەکاری دێنن و جگە لەخۆشیان بۆ کەسی تری باس ناکەن و نایدرکێنن. تاقیکردنەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە بەهێزترین بەهەڵەدابردن هەرگیز ناتوانێت کەسانی خاوەن عەقلی هۆشیار بەهەڵەدا بەرێت و هەڵیان خەڵەتێنێت بەڵکو تەنها خۆیان بەهەڵەدا دەبەن.

ئەمەش ئەو هۆکارەیە کە ئێمە دەترسین لێی بە مانەوەی عەقلمان بەستی و داهێزراوی لە کاتی توێژینەوە لە بارەی حەقیقەتی هەر شتێکەوە بێت، ئێمە دوور دەکەوینەوە لە وێنەی بەلگەکاری ئەمەش بەو ئیعتیبارەی بەربەستە لە بەردەم ئامانجەکانماندا، توێژینەوەش دەکەین لەبارەی هەر شتێکەوە کە زامنی بەردەوامبوونی وریایی بیر و هۆشمانە بۆ ئەوەی بە روونی

وناشکراییەکی گەورەتر نەزۆکی ئەم بەرنامەیەمان بۆ دەرکەوێت لە بارەی زانینی حەقیقەتەکانەوە، سەرنجی ئەوە دەدەین کە "جەدەلیەکان" ناتوانن لە پێوانەکاریەکی ڕاست و دروست داڕێژن بۆ بەدیهێنانی ئەنجامێکی ڕاستگۆ و باوەڕپێکراو، تەنها هەر لەسەر ئەوەی پێشوو دەڕۆن یان بەهەمان حەقیقەت کە بەڵگەکاریان لەسەر کردووە لە پێوانەکەیاندا. لەمەوە بەکورتی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەوانە هیچ شتێکی نوێ فێر نابن تەنها هەر لەو تاکە شێوە (وێنە)یەوە، لە ڕاستیدا مشتومڕی نەگۆڕ و خوو پێوەگرتوو هیچ سوود و کەڵکێکی نابێت بۆ ئەو کەسەی بیەوێت توێژینەوە بکات لە بارەی حەقیقەتەوە، لەوانەیە لەهەندێ کاتدا سوودی هەبێت ئەویش لە پێناوی دەرخستن و پیشاندانی هەندێ بەڵگەی ئاسان کە لەوەو پێش زانراوە و سەلمێنراوە. لە بەر ئەوە پێویستە ئەم مشت ومڕە (وتووێژە) بگوازینەوە لە فەلسەفەوە بۆ ڕەوانبیژی.

## دیکارت و بنچینەکانی ڕاستیە زانستیەکان:

دیکارت لەو وتارەیدا کە ناردویەتی بۆ (مرسین)ی هاوڕێی لە ڕۆژی ١٦٣٠/٤/١٥ی زاینیدا باس لە بنچینەکانی ڕاستیە زانستیەکان دەکات و دەڵێت: ... هێشتا بەسەرما تێنە پەڕیوە کە بیر دەکەمەوە لەو یادەوەریانەی لە لێکۆڵینەوەکانمدا دەمکرد لە بارەی فیزیکاوە و هەندێ مەسەلەی میتافیزیکی بەتایبەتی ئەم مەسەلەیە: کە حەقیقەتە بیرکاریەکانە، ئەوەیە کە دادەنرێت بە (هەمیشەیی ـ ئەبەدی)، ئەو ئەبەدیەی کە خوای لێ پێکهاتووە، ئەو ئەبەدیەش وەستاوە لەسەر خوا بە وەستانێکی تەواوەتی، نموونەش

لێرەدا بۆ ئەمە وەك هەر نموونەیەكیتری دروستكراوەكان وایە. ئەو وتەی دەڵێ: نەبوونی پێویستی ئەم حەقیقەتانە بۆ خوا، وا دەكات لە وێناكردنمان بۆ خوا وەك وێناكردنی (تصور) كردنی یۆنان بۆ (جۆپیتەر) و (ساترن) كە تێیدا خوا مل كەچی قەزا و قەدەر بوو. داوات لێدەكەم و هانت دەدەم دوودڵ مەبە لەو وتەیە لە هەموو شوێنێكدا هەر ئەو خودایەیە كە ئەم یاسایانەی دروستكردووە لە سروشتدا، هەروەك چۆن پادشایەك (مەلیك)ێك یاساكان دادەرێژێت لە مەملەكەتەكەی خۆیدا.

... ئەگەر هاتوو پرسیاریان لێكردیت و پێیان وتیت باشە ئەگەر وایە خوا ئەو هەموو حەقیقەتانەی دارشتووە، ئەوا دەبێ لە توانایشیدا بێت بیان گۆڕێت هەروەك چۆن پادشا یان (مەلیك)ێك دەتوانێت یاساكانی خۆی بگۆڕێت. لە وەڵامدا پێیان بڵێ: بەڵێ ئەمە دەگونجێت بێتوو گەر ویست و ئیرادەی خوای لەسەر بێت بۆ گۆڕانیان. بەڵام ئەگەر هاتوو ڕەخنە و ناڕەزاییان دەربڕی سەبارەت بەوەی، حەقیقەتەكان ئەبەدین و جێگیر و نەگۆڕن، لە وەڵامدا پێیان بڵێ، خواش بە هەمان شێوەیە. ئەگەر سكاڵا و ناڕەزاییان دەربڕی بەوەی ئایا خوا سەربەست و ئازادە؟ لەوەڵامدا بڵێ: هێز و توانا و دەسەڵاتی ئەو دوورە لە تێگەیشتنی ئێمەوە، بەڵام دەشێت بەشێوەیەكی گشتی دڵنیا بین لە هێز و توانای ئەو لە سەر دروستكردنی هەر شتێك كە لە تواناماندا نەبێت بەرنامەی بۆ دابنێین و لێی تێبگەین، ئەو (خوا) دابڕانی نیە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی كە ئێمە لێی دابڕاوین و هیچ تێگەیشتنێكمان نیە لە بارەیانەوە و لێیان تێناگەین. كاوێژكردنە بێتوو گەر لە خەیاڵ و ئەندێشەماندا بانگەشەی ئەوە بكەین كە هێز و توانا و دەسەڵاتێكی وا فراوانمان هەبێت وەك ئەوەی ئەو هەیەتی...

هەروەها لە نامەیەکی‌تر دا ناردوویەتی بۆ (مرسین) لە ڕۆژی ١٦٣٠/٥/٦ی زایینیدا دیکارت دەڵێت: بەلاّم لە بارەی حەقیقەتە ئەبەدیەکانەوە، من ئەم وتەیەی خۆم لەبارەیە دوپات دەکەمەوە: من ڕاستگۆم یان دەگونجێت لەبەر هیچ هۆیەك نا تەنها لەبەر ئەوەی کە زانست و زانیاری خوا ڕاستگۆیەیان گونجاوە، پێویست ناکات پێچەوانەکەی بڵێین چونکە دیار و ئاشکرایە لە ڕاستگۆییەکەیدا، هەروەها ڕاستگۆیی ئەو سەربەخۆ و بێلایەنە لەو بارەیەوە.

ئەگەر خەڵکی دەرکیان بەوە بکردایە کە دەیڵێین، ئەوا هەرگیز نەیان دەگووت و ئەو کفرەیان نەدەکرد کە دەڵێ حەقیقەتی شتێکی پێشووتر هەیە لە سەر زانیاری خوا. چونکە "ئیرادە و زانیاری خوا فەرمانێکن تایبەت بەخۆی" بەشێوەیەك ئەگەر بیەوێت شتێك ببێت یان داواکاری شتێك بێت ئەوا زانیویەتی، ئەو شتەش خۆی حەقیقەت بووە بۆ ئەمە. لە بەر ئەوە پێویست ناکات بڵێین حەقیقەتەکان بە ڕاستگۆیی دەمێننەوە هەتا کاتێك کە "خوا" بوونی نەبێت، ئەمەش لە بەر ئەوەی کە بوونی خوا پێش حەقیقەتەکانە و لەوان کۆنترە، هەر ئەوە کە حەقیقەتە و تاکە سەرچاوەی دەرچوونی هەموو حەقیقەتەکانیشە. بەلاّم خەڵکی لەمەدا بەهەڵە دا دەچن چونکە خوا دادەنێن بەو کائینە بێ‌کۆتاییەی کە لەسەری هەموویانەوەیە و هەر ئەویش خالق و دروستکەری هەموو ئەو شتانەیە کە تەنها ئیعتیماد دەکەنە سەر ئەو (پشت بە ئەو دەبەستن).

ئەوانە لەسەر پیتەکانی ناوی خوا دەوەستن و گومانیان بۆ ئەوە دەڕوات تەنها ئەوەیان بەسە کە دەیزانن بەوەی کە لەفزی وشەی خوا (فۆنەتیکی وشەی خوا) دەلالەت دەکات لەسەر هەمان ئەو لەفزەی کە بەلاتینی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە خەڵکی دەیپەرستن. بۆیە ئاساییە بە لای ئەمانەوە سەرێ

بەرز نەكەنەوە و نەڕوانن بە بیر و بۆچوونی خۆیاندا لەسەر ئەم شێوازە، كە واتە دەبنە بێ باوەڕەكان. هەر چەندە هەر ئەمانە خۆیان دەرك بە حەقیقەتە بیركاریەكان دەكەن بە دەرك كردنێكی تەواو بەبێ دەرك كردن بە حەقیقەتی بوونی خوا، بۆیە جێگای سەرسوڕمان نیە ئەوانە ئینكاری لەوە دا بكەن و سەرپێچی كار بن لەوەی كە ئەو حەقیقەتانە ئیعتیماد بكەنە سەر حەقیقەتی بوونی خوا. بەڵام نازانن كە خوا هۆكارێكە لەسەرووی هێز و توانای سنووری دەرك پێكردنی مرۆڤەوەیە، كەچی پێویستیی حەقیقەتە بیركاریەكان لەسنووری ئەو دەرك پێكردنانە تێنا پەڕێت.

## دیكارت و جیاكردنەوەی دەروون لە جەستە:

دیكارت لە كتێبی "*بنەماكانی فەلسەفە*" ( ٧٧ ) دا لەبارەی بوونی دەروون و پێویست بوونی جیاكردنەوەی لە جەستە بۆمان دەدوێت و دەڵێت:

١- بۆ قسەكردن لەسەر حەقیقەت، پێویستە لەسەرمان ئەگەر بۆ تەنها جارێكیش بووە، گومان بكەین لەهەموو شتەكان ئەوەندەی بۆمان دەكرێت.

ئێمە لە پێشدا منداڵ بووین كە ئێستا بووینەتە پیاو، هەروەها پێش گەیشتنمان بە هێز و توانای هۆشیاری كامڵ، لەبڕیاردان و فەرمانەكا نماندا جارێك ڕاستمان كردووە و جارێكی‌تریش بەهەڵە دا ڕۆیشتووین، لە پێناوی ئەمە دا ئەو بڕیارانەی كە داومانە بەم ئاڕاستەیە لە پەلەكردنەوە بووە بۆیە شكستمان خواردووە بۆ دەرك كردن بە حەقیقەت، بەشێوەیەك كاری كردۆتە سەرمان لەوانەیە نەتوانین ڕزگارمان بێت لێی، لەبەر ئەوەی نەمانتوانیوە ئەگەر بۆ تەنها جارێكیش بێت عەزممان جەزم كەین لەسەر گومانكردن لە

هەموو شتەکان، تەنانەت ئەو شتانەی کە کەمترین بابەتی گومانیان تیا بەدی دەکەین.

٢ـ هەروەها ئەوەش سوودبەخشە بۆمان، هەر شتێك ئیحتیمالی گوما نمان لێ کردبێت سیفەتی درۆمان خستۆتە پالی. بەلکو زۆر بەسوودە ئەو سیفەتی درۆیە بۆ هەر شتێك وێنامان کردووە کە کەمترین گومانی تیا بێت، ئەمە تا کاتێك بۆمان دەکرێ و لەتوانامانددا دەبێت یان ڕاستتر بلێین تا ئەو کاتەی هەندێ شتمان بۆ دەدۆزرێتەوە و نیشانەی ڕاستی دەردەکەوێت، با هەر لەسەری بمێنینەوە، تا بەیەکجاری دەگەینە ڕاستی شتەکان و بەئاسانی شتیان لە بارەوە فێر دەبین.

٣ـ لە ڕووبەڕووبونەوەی کارەکا نماندا پێویست بەگەڕانەوە ناکات بۆ ئەم گومانە. بەلام پێویستە سەرنجی ئەوە بدرێت من مەبەستم لەوە نیە کە ئەم ڕێگایە بەکار بهێنرێت. وەك ڕێگایەکی گشت گیری بۆ گومان، تەنها لەکاتی دەست پێکرد نمان نەبێت لە تێڕوانینی حەقیقەت. بەدلنیاییەوە ئەوەی پەیوەندی بە ناڕاستەکردنەکانی ژیا نمانەوە هەیە بەزۆری وامان لێدەکات تەنها شوێن بیروڕایەکی لەرزۆك بکەوین، لەبەر ئەوەش زۆر هەوڵ دەدەین زاڵ بین بەسەر هەموو دوودلی و گومانەکا نماندا، هەر چەندە لەوانەیە لەم کارەشدا هەمیشە هەلی کارکرد نمان لەدەست بچێت. هەروەها ئەگەر بێت و بیروڕا لەرزۆکەکان ( لاسەنگەکان ) بژمێرین لەیەك بابەتدا ئەوا ناتوانین پارسەنگی یەکێکیان بەوی‌تریان بدەینەوە، عەقڵ ئەم کارە تەواو دەکات و هەلدەستێ بە دیاریکردنی تەنها ڕایەك و شوێنی دەکەوێت پاش ئەوەی دلنیایی تەواوی تێدا بە دەست هێنا بە هەموو مانایەکی دلنیایی.

٤ـ بۆچی دەبێ گومان بکرێ لە حەقیقەتی شتە هەست پێکراوەکان؟

بەلاَم ئێمە لەم كاتەدا تەنها مەبەستمان لەخۆتەرخانكردنە بۆ توێژینەوە لە بارەی حەقیقەتەوە، بۆ یەكەم جار گومان دەخەینە سەر ئەو شتانەی هەستیان پێ دەكەین و لە خەیاڵماندان، لەوەی كە هەیە لەو حەقیقەتانە لەجیهاندا، بە تاقیكردنەوە بۆمان دەركەوتووە كە هەستەكا نمان بەهەڵەیاندا بردووین لە زۆر حاڵەتی سەر لێ تێكداندا، لە ئە نجامی نەبوونی ژیریی و دانایی تەواودا تەنها جارێك نەبووە كە لە ڕاستیەوە باوەڕمان كردبێت بەو هەڵخەڵەتاندنانە، هەروەها بۆیە لەوانەیە هەمیشە لە كاتی خەو دا خەونیان پێوە ببینین و لەخەیاڵماندا چەند ژمارەیەك ئامار كرابێت لەو شتانە كە لەدەرەوەی خەونەكا نماندا بوونیان نیە، بۆیە لە دواجار دا دەگێرسێینەوە لە سەر گومان لە هەموو شتێكدا، نیشانەیەك نامێنێتەوە لامان كە بەڵگاندن بێت لەسەر ئەوەی بیر و بۆچوونەكانی خەون زۆرینەی درۆیە وەك لەوانیتر.

٥ـ بۆچی دەبێ گومان بكرێت دووبارە لەسەلمێنراوە بیركاریەكان؟

پێویستە گومان بكەینەوە دووبارە لە هەموو شتەكان لەوانەی كە لەمەوپێش بۆمان دەركەوت و دڵنیایی تەواومان لێیان هەبوو بە مانای دڵنیایی تەنانەت لە سەلماندنە بیركاریەكان و بنەماكانیشی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕوون و ئاشكرایە زۆر بەتەواوی، ئەمەش لەبەر ئەوەی كە لێرەدا خەڵكانێك هەن هەڵەی تێدا دەكەن، بەجۆرێكی تایبەت، لەبەر ئەوەی ئێمە بیستوومانە ئەو خواوەندەی دروستی كردووین دەتوانێت ئەوەی دەیەوێت و ئارەزووی لێیە بیكات، تەنانەت تا ئێستاش نازانین ئایا ئێمە دروستكراوین بەشێوەیەك نیە كە تا هەتایە بە هەڵەدا چووبین و هەڵخەڵەتاو بین. تەنانەت لەو شتانەشدا كە باوەڕمان هێناوە بەزانین و ناسینی لەسەر باشترین شێواز، بەجۆرێك

بوارمان دەدات و وامان لێدەكات كە هەڵخەڵەتاو بین و بەهەڵەدا بچین هەندێ جار هەروەك لەمانەی پێشەوەدا بۆمان دەركەوت، ئەی ئەبێ بۆچی لێمان نەگەڕێ و بوارمان نەدات بۆ هەمیشە هەڵخەڵەتاو بین؟ ئەگەر ئەو تۆمەتەمان دایە پاڵ ئەو دروستكەرەی ئێمەی دروستكردووە بەوەی كە خواوەندێكی كامڵ نیە لە هێز و توانا و دەسەلاتدا، ئەمەش بەوەی كە ئەو تۆمەتە لە دەروونماندا بوونی هەبێت یان بەهۆی هەر شتێكیترەوە بێتن ئەوا هەر كاتێك بێت بەخەیاڵ و وێناكردنەكانماندا خواوەندەكەمان دادەنێین بەكەم هێز و توانا، ئەوا لەو بارەدا لەسەر حەقین چونكە بەو ئیعتیبارە خۆمان داناوە كە دەروونمان كامڵ نیە و كەم و كوڕیمان هەیە بەشێوەیەك كە هەڵخەڵەتاو و فێڵكراو نین بەهەمیشەیی.

٦- بەو ئازادیەی كە هەمانە وامان لێدەكات دوور كەوینەوە لە بڕواكردن بەو شتانەی كە گومانیان تێدایە، تا دوور كەوینەوە لەو هەڵخەڵەتاندن و فرۆفێڵە.

بەلام هەر چەندە دروستكەرەكەشمان هێز و توانای كامڵ بێت و تەنانەت چێژیش وەرگرێت لەو بەهەڵەداچوونەمان، كەچی لەگەڵ ئەمەشدا لە دەروونی خۆماندا هەست بە ئازادییەك دەكەین كە وامان لێدەكات دەست هەڵگرین و دوور كەوینەوە ـ ئەوەندەی لە تواناماندایە ـ لە بڕواهێنان و بەڕاست زانینی ئەو شتانەی كە لەدڵنیاییەوە نایانزانین و نایانناسین.

٧- لە هیچ شتێكدا ناكرێ گومانمان نەبێت تەنها لەوە دانەبێت كە ئێمە بوونمان هەیە، چونكە ئەمە یەكەمین ئاشنایی و زانینی دڵنیاییە كە دەكرێ بەدەستی بێنین.

لەكاتێكدا لەسەر ئەم ئاڕاستەیە هەر شتێك ڕەت كەینەوە كە هەڵگری كەمێ گومان بێت، بەڵكو بەدرۆی بزانین، كەواتە زۆر ئاساییە ئەوە بسەپێنین كە ئیتر خواوەندێك بوونی نیە و هەروەها ئاسمان و زەویش بوونیان نابێت و ئێمەش بە بێ جەستە دەبین، بەلام ناتوانین ئەوە بسەپێنین یان بیسەلمێنین كە ئێمە بوونمان نیە لەكاتێكدا گومانمان هەبێت لە ڕاستێتی هەموو ئەم شتانە. هەروەها توانای ئەوەشمان نیە ئەوە بسەپێنین یان گریمانەی ئەوە بكەین بەوەی كە هەر شتێك بیر نەكاتەوە بوونی نیە لە كاتێكدا ئەو بیر دەكاتەوە، بەجۆرێك هەر چەندە ئێمە زیادەڕەوی بكەین لە گریمانەكانماندا، ناتوانین دوور كەوینەوە لە بڕیاری ئەم ڕاستیە، من بیر دەكەمەوە كەواتە من هەم، كە ئەمە بۆ خۆی دەبێتە یەكەمین دڵنیایی لە نێو ئەو مەسەلانەدا كە مرۆڤ ڕابەرایەتی فیكری خۆی پێ دەنوێنێت ( نمایش ) دەكات لە شێوەیەكی ڕێكخراودا.

٨ـ هەر لەسەر ئەم پێكهاتەیە دووبارە جیا كردنەوە و هەڵاوێردن لەنێوان دەروون و جەستە دا بەدی دەكەین.

بۆ دەركەوتووە ئەمە باشترین هۆكارە تا بتوانین بە هۆیەوە زانیاری سروشتی دەروون دەست نیشان بكەین، بەوەی كە ( دەروون ) جەوهەرێكی تەواو جیاواز و جیاكراوەی هەیە لە جەستە. بەتاقیكردنەوە لە ماهیەتی خۆماندا بووینەتە ئەو كەسانەی وا بڕوامان هێناوە بەوەی كە لە دەرەوەی بیركردنەوەماندا شتێكی حەقیقەت یان هەبوو نەبێت، خۆشمان ئەوە دەزانین بەزانینێكی ڕوون و دیار كە بوونمان پێویستی نیە بە كشان یان هاوشێوەی كشان تا بگونجێت بیدەینە پاڵ جەستە، ئێمە بوونمان هەیە تەنها بە ئیعتیباری بیركردنەوەمان. لەدوای ئەمەش بیركردنەوەمان لەبارەی دەروونەوە

لە پێش بیرکردنەوەمان بووە لە بارەی جەستەوە و دڵنیاییشمان لە دەروون زیاتر بووە وەك لە جەستە، بەوەی کە هێشتا گومانمان هەیە لە بوونی جەستە، ئەوەی وا لەجیهاندایە، لەکاتێکدا لەسەر دڵنیاییەکی تەواو سەقامگیر بن بەوەی کە ئێمە بیر دەکەینەوە.

## دیکارت و یەکگرتنی دەروون و جەستە:

دیکارت لە کتێبەکەیدا "*بنەماکانی فەلسەفە*" ( ۷۸ ) چارەسەری مەسەلەی بوونی جەستەکانی کردووە و هەروەها لەبارەی یەکگرتنی دەروون و جەستە پێکەوە دەڵێ:

١ـ لەو هۆکارانەی کە بەهۆیانەوە فێربووین دەربارەی بوونی جەستەکان لە سەر شێوەیەکی دڵنیایی.

لەگەڵ ئەوەدا کە بڕوامان هێناوە بە بڕواهێنانێکی تەواو بە بوونی ڕاستەقینەی جەستەکان لە جیهاندا، تەنها ئەوە نەبێت کە پێشتر بەچاوی گومانەوە لێمان دەڕوانین، ئێمە بوونی خۆمان هەر لەسەرەتای ژیانمانەوە دانابوو لە پێکهاتەی چەند بڕیار و فرمانێك، بەلام ئێستا پێویستە لەسەرمان کە توێژینەوە بکەین لە بارەی ئەو هۆکارانەوە و زانیاری دڵنیایی ئەم بوونەیان پێ بەخشیوین. بەتاقیکردنەوە ناوەکیەکانی خۆماندا کەڵکمان وەرگرتووە لە هەر یەکە لەو شتانەی کە هەستی پێ دەکەین لە شتێکەوە دەرچن جگە لەخۆمان، بەوەی کە لە توانای ئێمە دا نیە ئەو هەستاوەریە یان جگە لەمیش بەدەست بێنین، ئەم حاڵەتەش ڕادەوەستێت لەسەر ئەو شتەی وا کار دەکاتە هەستمان. بەڵێ، دەگونجێ بپرسین ئایا ئەم شتە ئەگەر خوا یان شتێکیتر نەبێت کەواتە ئەبێ چ شتێکیتر بێت؟ بەلام هەست بەوە دەکەین،

یان ڕاستر بڵێین هەستەکانمان پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی دەرك بەم شتە بکەین، بەدەرك پێکردنێکی ڕوون و جیاکراوە، ماددەیەکی درێژەوەبوویە (کشاوە) لەدرێژی و پانی و قووڵیدا و چەند بەشێکی جیاوازی لە شکڵ و شێوەدا هەیە بەجۆرێك کە هەستەکانمانی لێوە دەردەچێت (یان هەست بە شتەکان دەکەین تێیدا) لەڕەنگ و بۆن و ئازار و ئەوانیتریش. هەرچەندە خوا ڕاستەوخۆ بیرۆکەی ئەم ماددە کشاوەی پێشان داوین، یان تەنانەت بواری بۆ ڕەخساندووین سەبارەت بە دەرچوونی ئەم بیرۆکەیە لە خۆماندا لە بارەی شتێکەوە نەکشان و درێژبوونەوەی هەبێت و نەجوڵە و شێوەشی هەبێت، بەڕادەیەك نەبوونی ئەمانە ببنە ڕێگر لە بەردەم بڕواهێنانمان بەوەی کە چێژ وەرگرین لە هەڵخەڵەتێنراویەکەمان. ئێمە وێنای ئەم ماددەیە وا دەکەین شتێکی جیاواز بێت لە خواوەند و لە عەقڵیشمان، بەڵام ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە کە بیر و بۆچوونمان لە بارەیەوە لە "دەروون"ەوە سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە بە بۆنەی ئەو جەستە دەرەکیانەوە کە هاوشێوەی ئەون بە هەموو مانایەکی هاوشێوەبوون.

لەکاتێکدا کە خوا هەڵمان ناخەڵەتێنێت و بەهەڵەماندا نابات چونکە ئەم کارانە دوورن لە سروشت و پێکهاتەی خواوەندەوە، کەواتە پێویستە لە سەرمان ئەو بوونە جەوهەریە بدۆزینەوە کە کشانی درێژی و پانی و قووڵی هەیە و ئێستا وەستاوە لە جیهاندا (دنیا)دا و هەموو تایبەتمەندێتیەکانی بەدەست بخەین ئەوەی وا لەبارەیەوە دەیزانین و زانیاریمان لیَ هەیە، ئەم جەوهەرەش (ناوەڕۆکەش) ڕاستە گەر ناوی بنێین جەستە یان جەوهەری شتە ماددیەکان.

**٢ـ پاشان لە چۆنێتی زانین و زانیاریمان دەربارەی یەکگرتنەوەی دەروون و جەستەمان. هەروەها پێویستە لەسەرمان بوونی جەستەیەکی دیاریکراوی یەکگرتوو لەگەڵ دەروونمان بەرهەم بێنین بەیەکگرتنێکی دڵنیایی کەر و جێگەی متمانە لە هەموو جەستەکانی دنیادا، هەروەها بەجۆرێکی وا بێت کە دەرك بکەین بە دەرك کردنێکی ڕوون و ئاشکرا کاتێك ئازارێکمان لێ ڕوو دەدات یان هەر جۆرە هەستکردنێکی تر بە بێ ئاگاداریمان بەو شتە، پاشان بۆ ئەوەی بڕیار و فەرمانەکان جێبەجێ کەین لەسایەی ئەو زانیاریەیە وەستاوەوە لە سروشتی دەروونداییە بەوەی کە ئەو هەستکردنانە تەنها لە دەروونەوە دەرنەچوون بەو ئیعتیبارەی دەروون تەنها شتێکی بیرکەرەوە بێت بەڵکو بەو ئیعتیبارەی دەروون یەکی گرتووە لەگەڵ شتێکی کشاوی بزێودا کە دەجووڵێتەوە بەهۆی بوونی ئەندامەکانیەوە، ئەم شتە بزۆکەش ڕاستە گەر ناوی بنێین جەستەی مرۆیی.**

**٣ـ لەوەدا کە هەستەکانمان سروشتی شتەکانمان فێر ناکەن، بەڵکو تەنها ڕێژەی سوود و زیانی شتەکانمان بۆ دەردەخەن.**

**تەنها ئەوەندە بەسە کە سەرنج بدەین لە هەموو ئەو شتانەی بەهۆی هەستەکانەوە دەرکی پێدەکەین، بەستراوە بەو یەکگرتنە توند و تۆڵ و متمانەدارەی نێوان دەروون و جەستەوە، وە ئێمەش بە هۆیەوە بەئاسانی بڕی ئەو سوود و کەڵکەی جەستە دەرەکیەکان دەزانین کە هەیانە بۆمان یان بە پێچەوانەوە بڕی ئەو زیانەش دەزانین کە پێمان دەگەیەنن.**

## دیکارت و ئازادی مرۆڤایەتی:

دیکارت لە کتێبەکەیدا "*بنەماکانی فەلسەفە*" (٣٧) بۆ چارەسەری کێشەی ئازادی مرۆڤایەتی دەنگی لێ هەڵدەبڕێت و دەڵێت:

٣٧- لەوەدا کە ئازادی گەورەترین پلەی کەماڵە بۆ مرۆڤ و هەر ئەویشە وای لێ دەکات دروستکراوێکی ستایش خوازیان گلەیی خواز بێت.

بەوەی کە ئیرادە لە سروشتی خۆیدا ماوەیەکی فراوانی هەیە، کەواتە چاکەیەکی گەورەیە گەر بتوانین بە هۆیەوە هێز و توانامان بشکێت بە سەر ئیش و کار دا یان ڕاستتر بە ئازادی و سەربەستی ئیش بکەین و بەمەش ببینە سەرۆك و سەردار لە ئیشەکا نماندا، پاشان شایانی پیاهەڵدان و مەدح کردن دەبین لە کاتێکدا گەر سەرکردایەتیکردنەکە چاکەخواز و ڕوو لە چاکە بێت. هەر وەك چۆن یەکیان گرتووە و ئێمەش داوامان لێنەکردوون، لە بەر ئەوەی ئەم ئامێرانە هیچیان لێوە دەرناچێت تەنها لەو بەرهەم هێنراوەوە نەبێت کە لە پێکهاتەی ئامێریەکەوە دەردەچێت، بەڵکو مەدح و ستایشی دروستکەرەکەی دەکەین ئەو دروست کەرەی کە ئەو هێز و توانا و ئیرادەیەی هەبووە لە سەر پێکهێنان و دروست کردنی بە وەستایی و کارامەیی‌یەکی گەورە، هەروەها لەبەر ئەوەی هێز و توانامان هەیە لەسەر دەستنیشانکردنی ڕاستی و جیاکردنەوەی لە درۆ، کەواتە دەبێ چاکەی زیاترمان تیا دەستەبەر بێت گەر هاتوو ئەو دیاریکردنەمان بڕیارێکی یەکجاری بوو ناچارمان کات پەنای بۆ بەرین وەك سەرچاوەیەکی دەرەوەی خۆمان.

٣٨ـ لەوەدا کە ئازادی ئیرادەی خۆمان بزانین نەك بە بەلگە بەلکو تەنها بە تاقیکردنەوە خۆی. هەر چۆنێکمان بوێت، بەشێوەیەك بگونجێ ئەم حەقیقەتە ئیعتیبار بکرێت لە زۆرترینی حاڵەتەکانی سەلمێنراو. لەوانەی پێشەوە بەلگەی ئاشکرامان لەسەر ئەمە پێشانداوە، لەکاتێکدا کە لە هەموو شتێکدا جێگامان دانابوو بۆ گومان، وە تیاشیاندا وامان سەپاندبوو کە دروستکەرەکەمان هێز و تواناکانی بەکار دێنێت لە سەر فێلْ کردنمان لە هەموو رووەکانەوە، ئێمە لە دەروونماندا دەرك بەو ئازادیە دەکەین کە لەتوانایدایە دوورمان خاتەوە لە بڕواکردن و بەڕاست زانینی هەر شتێك کە لەبارەیەوە زانین و زانیاریمان نیە بەزانین و زانیاریەکی تەواو. ئەمەمان دەرك پێکردووە بە دەرك پێکردنێکی جیاکراوە و دیار، بەلام توانامان ناشکێت بە سەر ئەو گومانەدا کە لەبارەیەوە هەمانە لەکاتی ئەو پێوەلکان و خۆهەلّواسینە گشت گیریە دا کە تووشی بڕیار و فەرمانەکانمان دەبێت، ئەوەش هیچ کەم ناکاتەوە لە دلنیاییمان لەبارەی هەر یەك لەو شتانەوە لەمەوپێش زانیاریمان هەبووە لە بارەیانەوە.

٤٠ـ لەوە دا کە دەیزانین لەبارەی دلنیاییمانەوە دووپارە بەوەی کە خواوەند هەموو شتەکانی حساب کردووە ( پێوانە و کێشانەی کردوون ) پێش ڕوودان و دروست کردنیان.

بەلام ئەوەی لەبارەی خواوە زانیومانە دوای ئەوە بوو کە بۆمان دەرکەوتووە هێز و توانا و دەسەلاتی ئەو لە گەورەیی و شکۆداری خۆیەوەیەتی بەشێوەیەك تاوانە بێتوو گەر بیر لەوە بکەینەوە و بمانەوێت شتێك ئەنجام بدەین یان شتێك بکەین کە پێشتر ئەو حسابی بۆ نەکردبێت و نەیخەملاندبێت، لەکاتی کەوتنە ناو کێشە و تەنگ و چەلەمە زۆر گەورەکانماندا ئاساییە هەولْ بدەین

و ڕێککەوین و ڕازی بین لە نێوان ویست و ئیرادەی خۆمان و بڕیار و فەرمانەکانی خوادا، یان تێبگەین و بچینە ناواخنی ئاستی ئازادیەکەمان و پێوانەکاری چاودێریی ئەزەلی بەوەی کە هەردووکیان لە چوارچێوەی عەقلماندایە.

٤١- لە چۆنێتی سەرکەوتنمان لە نێوان ئازادیمان و پێشینەی (مەزەندە) حساب بۆکراودا.

بۆ ڕزگاربوونمان لە هەموو ئەو کێشانە نابینین ئاستەنگی بێتە ڕێگامان ئەگەر سەرنج بدەین لەوەی کە بیر و بۆچوونمان کۆتاداره، بەڵام هێز و توانای خوا کامڵ و بێکۆتاییە، ئەو هێز و توانا و دەسەڵاتەیە کە هەر لە ئەزەلەوە پێی ناسراوە و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و ئەوەی بیەوێت بیکات دەیکات و دەبێت. لەسەر ئەم پێودانگە ئەو توانایەی لە عەقلی ئێمە دایە بەشی ئەوە ناکات تا بەڕوونی و جیاکراوەیی ئەو هێز و توانایەی لە خوادایە بناسینەوە و پێناسەی بکەین، بۆیە ئاستی ئەو هێز و توانایە تێناگەین لە خوادا هەیە و ئاست و ماوەی ئەو هێز و توانایەش تێناگەین بۆ ئەو ئاستەی وا دەیزانین و خوا پێی بەخشیوین کە چۆن ڕێگای پێداوین لەکار و کردەوەماندا ئازاد بین بەمانای ئازادی تەواوی هەرگیز نەبڕاوە و بێمەرج. لە لایەکیترەوە ئێمە لەسەر دڵنیایی لە ئازادی و نەبوونی دیاریکردنی ڕاوەستاو لە خۆماندا بەشێوەیەکە هیچی لەبارەوە نازانین بە ڕوونی و ئاشکرایی زیاتر، لەسەر ئەمەش هێز و توانای کاملی خواوەند ڕێگریمان لێناکات لەسەر ئەم دڵنیاییەمان. بەڵام ئێمە لەوەدا بەهەڵە دا دەچین بێتوو گەر گومانمان کرد لەوەی دەرکی پێ دەکەین لە دەروونماندا و دەبێ بوونی بزانین لە خۆماندا بەتاقیکردنەوە، لەبەر ئەوەی ئێمە هیچیتری لەبارەوە تێناگەین تا بیزانین

چونکە هەر لە سروشت و پێکهاتنماندا ناتوانین لەوە تێبگەین و دوورە لە تێگەیشتنی ئێمەوە.

## دیکارت و چاکسازی:

دیکارت لە کتێبەکەیدا "*کاردانەوەکانی دەروون*"( ٨٠ ) لە بارەی چاکسازیەوە بۆمان دەدوێت و دەڵێت:

١٥٢ـ لەبەر چ هۆیەك دەشێ مرۆڤ رێز لە دەروونی خۆی بگرێت. بە جۆرێك یەکێك لە پایەکانی ژیری و دانایی ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێت چۆن و بۆچی پێویستە لەسەری رێزی دەروونی خۆی بگرێت یان بە پێچەوانەوە بەسووك سەیری کات و نرخی بۆ دانەنێت. من هەوڵ دەدەم لەم بابەتەدا رای خۆم دەربڕم. من سەرنجم تەنها بۆ یەك شت دەچێت کە وامان لێدەکات شایانی ئەوە بین رێز لە خۆمان بگرین، ئەوەش هیچیتر نیە تەنها ئەوە نەبێت رابێین و مومارەسەی ئازادی خۆمان بکەین و زاڵ بین بەسەر ویست و ئیرادەماندا، ئەو کردەوانەی دەردەچن لە ئازادیمانەوە تەنها هەر ئەوانەن لە خۆگری مەدح و پیاهەڵگوتنن یان گلەیی و گازەندەن وەك هۆکارێك. ئەم ئازادیە بەزاڵ بوون بەسەر دەروونی خۆماندا بۆمان دەستەبەر دەکرێت و وامان لێدەکات هاوشێوەی خوا بین لەسەر ئاراستەیەك لە ئاراستەکان ئەمەش بە مەرجێك ئەو ئازادییەی کە پێمان بەخشراوە بە ناڕەوا و هەڵە بەکاری نەهێنین لە مافەکاندا.

١٥٣ـ ئەوەی بەخشندەیی دەروون پێی هەڵدەستێت. هەروەها من لەو بڕوایە دام کە بەخشندەیی ڕاستەقینە ئەوەیە وا لە مرۆڤ بکات رێزی دەروونی خۆی بگرێت بە گەورەترین رێزگرتن کە بۆی بلوێت، بەڵکو پێی هەڵسێت:

لە لایەکەوە لە زانیاریدا بەوەی کە لەوێدا هیچ مافێك ناگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ تەنها هەڵس و کەوتی ئازاد نەبێت لەویست و ئیرادەیدا و بەوەی کە لەوێدا هیچ شتێك نیە مەدحی کات یان گلەیی و گازەندەی لێ بکات لە پێناویدا تەنها بەکارهێنانی ئەو ویست و ئیرادەیە نەبێت بە چاك یان بەخراپ، لە لایەکیترەوە هەڵدەستێت بە هەست کردن بەو بانگهێشتە ڕاستگۆییەی لە دەرووندا هەیە لەسەر بەکارهێنانی ویست و ئیرادە بەبەکارهێنانێکی چاك، یان لەسەر دوورخستنەوەی ئەو ئیرادەیە لە خوار و خێچی و هەستان بەهەموو ئەو کار و کردەوانەی وا خێر و چاکەیان تیا بەدی دەکرێت. لەمەشدا مومارەسەیەکی تەواو پێویستە بۆ چاکسازی.

١٥٤ـ ئەم چاکسازیە دوورمان دەخاتەوە لەوەی کە بەسووك سەیری کەسانیتر بکەین.

ئەوانەی خاوەنی ئەم زانین و هەستکردنەن لە دەروونی خۆیاندا، زۆر ئاساییە لایان کە قایل بن بەوەی کە هەر مرۆڤێکیتر دەتوانێ وەك ئەوان ئەم زانین و هەستکردنە بەدەست بێنێت، چونکە لەسەر هیچ مەرامێك ڕانەوەستاون بەرامبەر خەڵکانی جگە لەخۆیان، لەبەر ئەوە ڕقیان هەرگیز لە هیچ کەسێك نابێتەوە و بەسووك سەیری ناکەن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمانە زۆر تێبینی خەڵکانیتر دەکەن کە هەڵە دەکەن و لاوازیان لێ بەدی دەکرێت، کەچی ئەمانە زیاتر ئارەزوویان لەوەیە خۆیان دوورە پەرێز بگرن لەسەر کۆنەکردنی ئەو جۆرە خەڵکانە، زیاتریش باوەڕیان بۆ ئەوە دەچێت ئەو جۆرە هەڵانە دەگەڕێتەوە بۆ کەم و کوڕی لە زانین و زانیاری دا وەك لەوەی بگەڕێتەوە بۆ خراپی لە نیەتدا( لە مەبەستدا ).

١٥٥ـ لەخاکی بوون و بەخشندەییدا.( ٨١ )

بەڕێزترین خەڵکانێك ئەوانەن وا کەسانی خاکی و بێفیزن. خاکیی بوونی چاك و بەخشندەیی تەنها ئەو بیر و بۆچوونە نیە لە لاوازی سروشتماندا بێت، ئەو هەڵانەشی لەوانەیە ئەنجامان دابێت لە ڕابردوو دا یان لە داهاتوودا ئەنجامی بدەین، کەمتر نیە لەو هەڵانەی خەڵکانیتر جگە لەخۆمان ئەنجامی دەدەن، ئەمەشە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانین بەخشندە و چاکەخواز بین لەسەر خەڵکانیتر و لەو بڕوایە داین ئەوانیش وەك ئێمە خاوەن ئەو ئیرادە ئازادەن و توانایان دەشکێت بەسەر ئەوەدا کە مومارەسەی ئەو ویست و ئیرادەیەی خۆیان بکەن.

١٥٦ـ لەسیفەتەکانی بەخشندەیی ئەوەیە کە چارەسەری ئەو کاردانەوانە بکات لە ناچاریەوە سەر هەڵدەدەن.

ئەوانەی ئەم بەخشندەییە بەدەست دەهێنن لە سروشتیاندا ئارەزووی ئەوە دەکەن لە کار و کردەوەکانیاندا بە ڕوونی ڕەنگبداتەوە بە بێ خوار و خێچی ئەوەندەی بۆیان بکرێ و لەتوانایاندا بێت. چونکە ئەم جۆرە کەسانە هیچ شتێك کاریان تێناکات و ساردیان ناکاتەوە لەوەی خزمەتی خەڵك نەکەن و سوودە تایبەتیەکانی خۆیان وەلاوە نەنێن، ئەمانە هەمیشە ئامادەباشن و پێشڕەوی دەکەن بۆ کاری باش و خێردار بۆ کەسانی دەوروبەریان.

ئەمانە سەرەڕای ئەم کارەشیان هەمیشە زاڵن بە زاڵبوونێکی تەواو بەسەر کاردانەوەکانی خۆیاندا بە تایبەتی بەسەر ئارەزووەکانیاندا و بەسەر غیرە و حەسوودیدا، لەبەر ئەوەی هیچ شتێکی وا نیە ئەمانە پێویستیان بێت و چاوەڕوانی لێ بکەن لە کەسانی جگە لەخۆیان، تەنها شتێك بە بڕوای ئەوان شایانی ئەوەیە هەوڵ و کۆششی زۆری لە پێناو دا بدرێت بۆ بەدەست هێنانی ئەویش ئەوەیە ڕێگا بەخۆیان نادەن کە بەسووك سەیری خەڵکانیتر بکەن

چونکە رێز بۆ هەموو کەسێك دادەنێن، ئەمە لەترسەوە نیە کە خەڵك بترسن بەڵکو لە بڕوا بوونیانەوە دێت بەو چاکە خوازی و بەخشندەییەی کە دڵنیایی و بڕوا بەخۆبوون دەبەخشێتە دەروونیان! هەروەها لە تووڕەبوون و ڕق و کینەشەوە نیە لە بەر ئەوەی کە زیانیان پێگەیشتووە لەسەر دەستی دوژمنەکانیاندا.

## دواوێستگەی ئەم گەشتە:

پاش ئەوەی فەلسەفەی دیکارتمان پێشاندا لەگەڵ هەندێ لە بیر و بۆچوونە عەقلانیەکانی، دەگەینە ئەو ئاکامەی بڵێین: ڕوون و ئاشکرا و سەلمێنراوە کە فەلسەفەی دیکارت بریتی‌یە لە پوختەی فەلسەفە و زانستی عیرفانی کە لەم سەردەمەی ئێستاماندا جێبەجێ دەکرێت بەو ئیعتیبارەی ئەم فەلسەفەیە بەرجەستەکردنی "ئایدیالی ڕەهایە"، ئەم چاخەی ئێستامان چاخی ئامێری میکانیکیە، بۆیە ئارەزووەکانی دیکارت بۆ پاڵپشتی کردنی ئامێری میکانیکی و جێگیرکردنی دەگەڕێتەوە بۆ کشان و درێژبوونەوە جگە لە عەقڵ نەبێت.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە بیر و ڕاکانی دیکارت و کاردانەوە عەقلانیەکانی دەتوانن جێگای هەندێ لەزانستە نوێکان بگرنەوە، وەك دەروونزانی ئەزموونگەریی و کۆمەڵناسی چۆنیەتی بەشێوەیەك هەر دووکیان هاوتای یەکترن و تەواوکەری دیاردە سایکۆلۆجی یان کۆمەڵایەتیەکانن لەو توخم و یەك مانابیانەدا کە مل کەچن بۆ پێوانەکاریە بیرکاریەکان.

دیکارت متمانەی بەو ئالیەتە زانیاریە دڵنیاییکەرە هەبوو کە عەقڵ بەرجەستەی دەکرد، هەروەها بەو جوڵە هاتووەش لە نادیارەوە بۆ دیار و لە بیرۆکەوە بۆ بوون و لە خودەوە بۆ بابەت و لەسەلماندنی هۆشیاریەوە بۆ سەلماندنی جەوهەری.

## پەراویزەکان:

١ـ بڕوانە : خطاب ديكارت الى الأميرة اليصابات في مايوأويونيه سنة ١٦٤٥ م، ص ٩٤٨.

٢ـ بڕوانە : خطاب ديكارت الى براسيه في ١٦٤٩/٤/٢٣م.

٣ـ بڕوانە : خطاب ديكارت الى شانو في ١٦٤٨/٨/٦.

٤ـ بڕوانە : ديكارت ـ المقال في المنهج.

٥ـ بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٦ـ بڕوانە : ديكارت، المقال في المنهج، ل (١٠٦ ـ ١٠٧).

٧ـ بڕوانە : ديكارت، المقال في المنهج، ل (٩٥ ـ ٩٦).

٨ـ بڕوانە : الاكتشاف الميتافيزيقي عند ديكارت (ص ٢٦ ـ ٣٦).

٩ـ بڕوانە : ديكارت، المقال في المنهج، ل ٩٦.

١٠ـ بڕوانە : خطاب لديكارت في ١٦٣٨/٩/١٢ (أ ـ ت. المجلد الثاني ٣٧٨).

١١ـ بڕوانە : مجموعة مؤلفات ديكارت : ص ١٧٩.

١٢ـ بڕوانە : بابيه، حياة ديكارت، ج١، ص ٨١.

١٣ـ بڕوانە : ف ـ الكييه : الاكتشاف الميتافيزيقي للأنسان عند ديكارت، ص ٤٥ ـ ٤٦.

١٤ـ بڕوانە : بابيه، حياة ديكارت، ج١، ص١٦٠ ـ ١٦٦. ألكييه، ديكارت ص ٢٢ـ ٢٣.

١٥ـ بڕوانە : بابيه، حياة ديكارت، ص٧.

١٦ـ بڕوانە : مؤلفات ديكارت، م١٠، ص ٣٧٨.

١٧ـ بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو، م١٠، ص ٣٧٩.

١٨ـ بڕوانە : رسائل ديكارت : ج ٤، ص ٢٤٨ ـ ٢٦٢، ٣٢٠ ـ ٣٣٠.

١٩ـ بڕوانە : ديكارت، رسالته الى شانو في ١٦٤٦/١١/١ ل (١٠٠٦ ـ ١٠٠٧).

٢٠ـ بڕوانە : رسالة ديكارت الى مرسين في ١٦٣٩/١/٩ ل ٨١٨.

٢١ـ بڕوانە : ديكارت ـ الأنسان و المفكر ص ٣٢٦.

٢٢ـ بڕوانە : هاملان/ مذهب ديكارت، ص٣٣.

٢٣ـ بڕوانە : قواعد لهداية العقل، القاعدة ٤ في البداية.

٢٤ـ بڕوانە : قواعد لهداية العقل، القاعدة ٤، ص ٣٧١ ـ ٣٧٣.

٢٥ـ بڕوانە : مؤلفات ديكارت ـ ص ٣٦٠.

٢٦ـ بڕوانە : قواعد لهداية العقل، القاعدة ١، ص٢.

٢٧ـ بڕوانە : قواعد لهداية العقل، القاعدة ١٢، التأملات، التأمل الرابع.

٢٨ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ القاعده ٣، ص ٣٦٩.
٢٩ـ بڕوانه : دیكارت، المقال في المنهج، ص ٩٢.
٣٠ـ بڕوانه : دیكارت، مبادي الفلسفة، المقدمة، ص ٤٢٤.
٣١ـ بڕوانه : التأمل الأول، دیكارت، ص١٦١.
٣٢ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل ص ١٦٢.
٣٣ـ بڕوانه : دیكارت، المقال في المنهج، ج٤، ص ١١٣.
٣٤ـ بڕوانه : التأمل الأول، ص١٦٢. مبادي الفلسفة، الجزء الأول فقرة، ٥.
٣٥ـ بڕوانه : دیكارت، مبادي الفلسفة، الباب الأول، مادة ٧.
٣٦ـ بڕوانه : دیكارت، المقال في المنهج، القسم الرابع، ص ٥١.
٣٧ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٥.
٣٨ـ بڕوانه : دیكارت، مبادي الفلسفة، الباب الأول، مادة ٨.
٣٩ـ بڕوانه : دیكارت، المقال في المنهج، القسم الرابع، ص٣٢ ـ ٣٣.
٤٠ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الثالث: ص ١٧٨ ـ ١٧٩.
٤١ـ بڕوانه : دیكارت، التأملات، التأمل الثالث، ص ١٧٩ ـ ١٨٠.
٤٢ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الثالث: ص ١٨٠ ـ ١٨١.
٤٣ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الثالث: ص ١٨١.
٤٤ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٤.
٤٥ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٣ ـ ١٨٤.
٤٦ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٨٣.
٤٧ـ بڕوانه : هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ١٩١.
٤٨ـ بڕوانه : دیكارت، مبادي الفلسفة : الجزء الأول.
٤٩ـ بڕوانه : دیكارت،المقال في المنهج، ج ٤، ص ١١٥. التأمل الثالث، ص ١٧٨.
٥٠ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الثالث: ص ١٩٣. المبادي الفلسفية، ص ٢٠٣.
٥١ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الخاص، ص ٢٠١ ـ ٢٠٣.
٥٢ـ بڕوانه : دیكارت، التأمل الخامس، ص ٢٠٢.
٥٣ـ بڕوانه : دیكارت،المقال في المنهج، الجزء ١١٦٤، التأمل الخامس، ( ٢٩٣ ـ ٢٠٤ ).
٥٤ـ بڕوانه : دیكارت،الأجابة عن الأعتراضات الأولى، ٢٤٦.
٥٥ـ بڕوانه : دیكارت،التأملات، التأمل الخامس، ٢٠٥.

٥٦ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة : الجزء الأول، ص ١٢١.

٥٧ـ بڕوانە : دیکارت، التأملات، الثاني، ص٨١.

٥٨ـ بڕوانە : دیکارت، المؤلفات الكاملة "العالم" المجلد الحادي عشر، ص ٣٧، المقال عن المنهج، ص ١٢٢.

٥٩ـ بڕوانە : دیکارت، التأملات، التأمل الثالث، الأجاية على الأعتراضات الخمسة ٣٨٣. : دیکارت، المقال في المنهج، ص ١٢٢.

٦١ـ بڕوانە : دیکارت، المقال في المنهج، ص ٧٥ ـ ٧٧.

٦٢ـ بڕوانە : دیکارت، المقال في المنهج، ص ٧٥ ـ ٧٧.

٦٣ـ بڕوانە : دیکارت، العالم ـ المجلد الحادي عشر.

٦٤ـ بڕوانە : دیکارت، العالم ـ المجلد الحادي عشر. مبادي الفلسفة، ج٢، ق١٦.

٦٥ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج٢، فقرة ٣٧.

٦٦ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج٢، فقرة ٤٥ ـ ٥٢.

٦٧ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج٤، فقرة ٢٠٤.

٦٨ـ بڕوانە : دیکارت، المقال في المنهج، ج٦، ص ١٣٤.

٦٩ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ص ٤٢٨.

٧٠ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ص ٤٢٨.

٧١ـ بڕوانە : دیکارت، المقال في المنهج، ج٣، ص ١١١.

٧٢ـ بڕوانە : دیکارت، رسالة الى الأميره اليصابات في ١٥ سبتمبر ١٦٤٥.

٧٣ـ بڕوانە : دیکارت، ارسالة انفعالات : المواد ١٥٢ ـ ١٥٦.

٧٤ـ بڕوانە : مؤلفات دیکارت : م ٤، ص ٢٩٣.

٧٥ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، المقدمة ص ٨٤.

٧٦ـ بڕوانە : دیکارت، رسائل في الأخلاق، ص ١٠٧.

٧٧ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج١، ف(١ ـ ٨).

٧٨ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج٢.

٧٩ـ بڕوانە : دیکارت، مبادي الفلسفة، ج١ـ ف ٣٧ـ ٣٩ـ ٤٠ـ ٤١.

٨٠ـ بڕوانە : دیکارت، انفعالات النفس، ف ١٥٢ ـ ١٥٦.

٨١ـ خاکی : خاکێتی، واتە بێفیزیی و خۆبەزل نەزانین (وەرگێڕی کوردی).

# فەرهەنگۆكی وشە زانستی و فەلسەفیەكان

| كوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| ( آ ) | |
| ئایدیا، ئایدیال | مثالية، مثالي |
| ئەودیوی سروشت | ماوراء الطبيعة |
| ئەڵتەرناتیڤ | بديل |
| ئایدۆلۆژیا | فكرة |
| ئەندازە | هندسة |
| ئەندازەیی | هندسي |
| ئاكار | أخلاق |
| ئاكارزانی | علم الأخلاق |
| ئاومز | عقل |
| ئامانج | هدف |
| ( ب ) | |
| بیرۆكە | فكرة |
| بیروبۆچوون | أفكار |
| بەرایی، سەرەتایی | بدائية |
| بیر و باوەڕ | مبدأ، فكرة |

| | |
|---|---|
| بنەما، بنەماکان | قاعدة، قواعد |
| بنچینە، بناغە | أساس |
| بەڵگە نەویست | بديهية، بديهي |
| بەڵگە، بەڵگاندن | دليل، دلالات |
| بوون، هەبوون | الوجود |
| بووەکان | موجودات |
| بیرکاریانە | الرياضيات |
| بیرکاری زانی | علم الرياضيات |
| بڵندنما | متعال، عالى |
| بەرنامە | برامج، منهج |
| بیرمەند، بیریار | مفكر |
| بەها، نرخ | قيمة |

( پ )

| | |
|---|---|
| پرۆگرام( میتۆد ) | منهج، طريقة |
| پەی بردن | الحدس |
| پلان، نەخشە | خطة، خريطة |
| پسپۆڕ، پسپۆڕی | خبير، افصائي، أختصاص |

( ت )

| | |
|---|---|
| تێڕامان | تأملات |

| تایبه تمەندی | خصوصية |
|---|---|
| **( ج )** | |
| جیاوازی | فرق |
| جەبری | جبرية |
| جێگیر، نەگۆڕ | ثابت، وطد |
| جیاکردنەوە | تمييز |
| جوڵە | حركة |
| جەدەلیەکان | الجدليون |
| **( چ )** | |
| چرکە ، چرکەسات | لحظة |
| چەرخ، چاخ | عصر |
| **( خ )** | |
| خەیاڵ، ئەندێشە | وهم، خيال |
| خانەدان، ئەرستۆکرات | أرستوقراطية |
| خەون ، خەون بینین | حلم، الأحتلام |
| خواوەند، پەروەرندە | إله ، رب ، الله |
| خولیا، ئارەزوو | رغبة ، هواية |

( د )

| | |
|---|---|
| دەستوور، ڕێسا | نظام، قانون |
| دەستەواژە | عبارة |
| دروستکراوەکان | الموجودات |
| دۆزینەوە | الأستنباط |
| دوورخستنەوە | تبعید |
| دەروونزانی ئەزموونگەریی | علم النفس التجریبي |
| دیاردە، هۆکار | سبب، علە |
| دەروون | نفس |
| دەستاوێژ | عبارە |
| داماڵین | تجرید |

( ڕ )

| | |
|---|---|
| ڕێژە، ڕێژەیی | نسبة، نسبي |
| ڕاستی، ڕاستێتی | حق، الحقیقة |
| ڕاست دەرچوون | الحقیقة |
| ڕەنگرێژی | تخطیط |
| ڕێباز، ڕێگا | طریق، طریقة |
| ڕامانەکان | تأملات |
| ڕۆچوون | غرق، انغمار |

| | |
|---|---|
| ڕەوشت | أخلاق، خلق |
| ڕەوشتکاری | أخلاقيات |
| ڕەوانبێژی | بلاغة |
| ڕاڤە، تەفسیر | شرح، تفسير |
| ڕەها | مطلق |

(ز)

| | |
|---|---|
| زەین، چاوی عەقڵ | زيهن، عين العقل |
| چاوی ئاوەز | عين الزيهن |
| زنجیرە | السلسلة |
| زادەی بیر | مولد فكر |
| زانا، زانیاری | عالم، علم، معرفة |

(ژ)

| | |
|---|---|
| ژیری | الحكمة |
| ژیربێژی( لۆژیك ) | ملاحظة |
| ژیر ودانا | حكيم |

(س)

| | |
|---|---|
| سەلماندن | برهان |
| سەرنج | ملاحظة |

| | |
|---|---|
| سەیر، نامۆ | غریب، عجیب |
| سەردەم | عهد، عصر |

( ش )

| | |
|---|---|
| شكانەوەی ڕووناكی یان | |
| شكانەوەی تیشك | انكسار الضوء |
| شارەزایی | المام |
| شێوە، وێنە | شكل |

( ف )

| | |
|---|---|
| فەیلەسووف، پیتۆڵ | فیلسوف |

( ق )

| | |
|---|---|
| قایل، قایل بوون | اكتفاء |
| قەرەبوو | تعویض |

( ك )

| | |
|---|---|
| كشتیارەكان، جوتیارەكان | فلاحون |
| كۆمەڵناسی، كۆمەڵزانی | علم الاجتماعی |
| كات | زمن |
| كات و سات | وقت |

| | |
|---|---|
| کورتە سات | لحظة قصيرة( لحظة صغيرة جداً ) |

**( گ )**

| | |
|---|---|
| گومان | الشك |
| گریمانە | دلالة |

**( ل )**

| | |
|---|---|
| لۆژیکانە ، لۆجیك | منطقي، المنطقية( لوجيكستية ) |
| لێکدانەوە، ڕاڤەکردن | تفسير، تفسيرات |
| لێك خشاندن، لێخشاندنەکان | احتكاك، احتكاكات |

**( م )**

| | |
|---|---|
| مەرج | شرط |
| ماف، مافەکان | حق، حقوق |
| مرۆیی | انساني |
| مرۆڤایەتی | انسانية |
| مرۆڤ، تاك، کەس، خود | انسان، فرد، شخص، ذات |
| مێوی هەنگوین | شمعه عسل |
| مۆمی هەنگوینی | شمعه عسل |

( ن )

| | |
|---|---|
| نموونە | امثلة |
| نموونەیی | مثالي، مثالية |
| نەوی، نزم | أسفل |

( و )

| | |
|---|---|
| وێنە، شێوە | صورة |
| وێناکردن | تصور |
| وەلانان | ترك، رفض، مرفوض |
| وابەستەبوون | منسجم، متعلق |

( ه )

| | |
|---|---|
| هێمن، لەسەرخۆ | الرزانة، هادي |
| هیوا، بێهیوایی | أمل، خيبة أمل |
| هۆش، هۆشیاری | وعي، واعي |
| هۆشداری | توعية |
| هاوتا، هاوسەنگ | توازن |
| هەنگاو | خطوة |
| هەست، هەستەکان | حس، حواس( شعور) |
| هەستاوەری | إحساسات |

**( ى )**

| | |
|---|---|
| **یەسوعیەكان** | **اليسوعيون** |
| **یەك لەدوای یەك** | **متتالى** |
| **یەكێتی، یەكگرتن، یەكگرتوو** | **الوحدة، الأتحاد ( )** |

**سەرچاوەکان:**

**دەقی ئەم وەرگێڕانە لەم کتێبە وەرگیراوە:**

**فی سبیل موسوعە فلسفیە**

**دیکارت**

**تألیف: الدکتور مصطفی غالب**

**بیروت ـ لبنان ـ ١٩٨٢**

**منشورات دارومکتبة الهلال**

**تێبینی: ئەو بەشە کورتە لە ژێر ناوی (دیکارت و بوونی خوا) دایە دووبارەکردنەوەیەکی هەمان ئەو بەشەی (خوا لای دیکارت)ە بەلام بەکەمێ لێ زیادکردن و پاش و پێش خستنەوە لەبەر ئەوە بەباشم نەزانی دووبارەی کەمەوە و هەمان ڕێچکەی نووسەر بگرمە بەر بۆیە وازم لێ هێنا با خوێنەری بەڕێز بەوە تێ نەگات بە ئەنقەست وەرم نەگێڕاوە و ڕیز پەڕم کردووە.**

**هەروەها سوودیش لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**

**١ـ دیکارت(نامیلکە) ـ زنجیرەی ژمارە (٤) لە کتێبی گیرفان ـ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ـ پۆل ستراتێرن ـ وەرگێڕانی: ڕەووف بێگەرد.**

**٢ـ فەرهەنگی شیرین ـ عەرەبی، کوردی ـ فاضل نظام الدین ـ چاپی چوارەم ـ سلێمانی ٢٠٠٤.**

**٣ـ فەرهەنگی ئەستێرە گەشە ـ کوردی، عەرەبی ـ فاضل نظام الدین ـ چاپی دووەم ـ ١٩٩٠.**

**٤ـ قاموس (المورد E، عەرەبی) ـ منیر بعلبکی ـ بیروت ـ لبنان طبعة ٢٠٠٤.**

**٥ـ عمید (حسن عمید) ـ قاموس (فارسی ـ فارسی) ـ طبعة ٢٠٠٢ ـ تهران.**

**٦ـ فەلسەفە، ڕۆشنگەری، فیندەمیتالیزم ـ نووسینی: هاشم صالح ـ وەرگێڕانی شوان ئەحمەد ـ چاپی یەکەم، ٢٠٠٣ ـ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.**

# ناوەرۆك

پێشکەشکردن:

* پێشکەشە تەنها بەدایکم

یەکەمین مامۆستای ژیانم و دواهەمین ترپەی لێدانی دڵم.